# پێشـەکـی

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای گەورەی جیهانیان و درووود سەلام و ڕەحمەتی خوا لەسەر پێشەواو پێغەمبەری مرۆڤایەتی محمد(صلى الله عليه وسلم) و یارو یاوەرانی بێت تا ڕۆژی دوایی لەپاشان دا:

باسەکانی(**جۆرەکانی ئاو و ئەحکامەکانیان، پیسی و جۆرەکانی و پاککردنەوەی پیسی و ئەحکامەکانیان، ئەحکامی دەست بە ئاو گەیاندن، سوننەتە سروشتیەکان، دەست نوێژگرتن و ئەحکامەکانی، مەسح کردن و ئەحکامەکانی، غوسڵ دەرکردن و ئەحکامەکانی، تەیەموم و ئەحکامەکانی، خوێنەکانی ئافرەت(سوڕی مانگانە، پاش منداڵ بون، جاری و، ئەحکامەکانیان).**

بەپێویستم زانی سەرجەم پرسیارو وەڵامەکانی دوای وانەکان و باسی(پاککردنەوە) و بەشی عیبادات و پەرستنەکان کە پێك هاتوە لەو باسانەی سەرەوە بەکورتی و پوختی بکەم بە نامیلکەیەك و بڵاوی بکەمەوە تاوەکو، زۆرێك لە مسوڵمانان سودمەندبن لێی، چونکە بەڕاستی تاوەکو وانەکانمان دەست پێ نەکرد، نەم زانی کە تاکی کورد زۆر پێویستیان هەیە بەم باسە فیقهی و گرنگانەو لەزۆر حوکمە شەرعیەکانی فیقهی بێ ئاگان، بەداخەوە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ شەرم و داب و نەریت کە ڕێگری کردووە لە پرسیارکردن و، وە کەمتەرخەمی ئێمەو مانانیش وەك بانگخوازان و مامۆستایانی ئاینی کاریگەری نەرێنی هەبووە لەسەر ڕون نەکردنەوەی ئەم باسانە بە جوانی!،ئەم پرسیارو وەڵامانە ڕاستە تایبەتە بە خوشکانی بەڕێزەوە بەڵام برایانی بەڕێزیش دەتوانن سودیان لێ ببینن.

داواکارین لەخوای گەورە بەنیەتێکی پاکەوە لێمان قبوڵ بفەرموویێت و لەهەڵەو کەم و کورتیەکانمان خۆش بوبێت و بیکاتە تویشوی قیامەتی سەرجەم ئەو زاناو بانگخوازو پیاوچاکانەی کەوا ماندووبون لە کۆکردنەوەو گەیاندنی ئەم زانستە بەرزو پیرۆزەو، ئێمەش بکاتە پێویستی بۆ خزمەتی دینەکەی یارب العالمین.

**لەگەڵ ڕێزی براتان" ڕەنج شێخانی**

**١٥ی جمادی کۆتایی ١٤٣٧ی کۆچی - بەرامبەر - ٢٤ . ٣ . ٢٠١٦ ی زانینی**

## بەشى يەكەم
## (سـودى خوێندنى زانسـتى شـەرعى)

---

**پرسـيارى(١)**

سـودى خوێندنى زانسـتى فيقهى شـه رعى چى يه؟

**وەلام:**

بۆ راست كردنەوەى ئەوهەلانەى كە لەپەرستن وعيبادەتەكانمان دا ئەنجامى ئەدەين ، وە بۆ خۆپاراستن لەپۆخلەواتى (الشرك) هاوبەش دانان و(البدعة) داهێنراو، بەهۆى ئەو زانستەوەيە كەوا مرۆڤى باوەڕدار دەتوانێ پەرستن و عيبادەتەكانى راست بكاتەوە و كەموكورتيەكانى چاك بكات، كە ئەوەش تەنها بە پەرستنى راست و دروست دەبێت بەپێى بەڵگەكانى قورئان و سوننەت و ڕونكردنەوەى لەلايەن هاوەلان و پياوچاكانى پێشين و زانا سەر راستەكانى نەتەوەى ئيسلامەوە(ڕەزاو ڕەحمەتى خواى گەورەيان لێ بێت).

---

**پرسـيارى(٢)**

بەپێى بەڵگە مێژوويەكانى ئيسلام ژمارە ى ئە و هاوە ڵە پياو و ئافرە تانە چە ندبون كە سوننە تيان لە پێغەمبە رى خواوە (صلى الله عليه وسلم) بۆ نە وە كانى دواى خۆيان نقل كردوە؟

**وەلام:**

ژمارەى ئەو هاوەڵەبەرێزانەى كەسوننەتيان گێراوەتەوە لەخۆشەويستمان محمد (صلى الله عليه وسلم) (٤٠٠٠) چوار هەزارهاوەڵ بون (رەزاى خوايان لى بيت).

---

**پرسـيارى(٣)**

بە كێ دە وترێت هاوەڵ(الصحابي)؟

**وەلام:**

هەركەسێك پێغەمبەرى خواى (عليه صلاة والسلام) بينى بێت يا گوێى لەدەنگى بوبێت و لەخزمەتى دا بوبێت و باوەڕى پێى هێنا بێت پێى دەوترێت هاوەڵ(الصحابي)(رضي الله عنهما).

---

**پرسـیاری(٤)**

بە کـێ دە وترێت شـوێن کـەوتوان (التابعـین)؟

**وەڵام:**

تابیعـی و شـوێن کـەوتوان ئـەوانـەن کـە هاوەڵانـی پێغـەمبـەری خـوایان بینیوە (صلـی اللە علـیە وسـلم) خـوا لـێ یان رازی بێت،بەڵام پێغـەمبـەری خـوایان نـەبینیوە(صلـی اللە علـیە وسـلم).

---

**پرسـیاری(٥)**

چوار پێشـەواکـەی مـەزهـەبـەکـانی ئیسـلام ناویان چـی یە؟، وە ئایا لـە هاوە ڵانـی پێغـەمبـەری خـوان(صلـی اللە علـیە وسـلم).؟،یان لـە پیاوچاکـانی تابیعـینـن؟

**وەڵام:**

پێشـەوایانی مـەزهـەبـەکـان

(پێشـەوا مالیك ٢. پێشـەوا حـەنـەفی ٣. پێشـەوا شـافیعـی ٤. پێشـەوا ئـەحـمـەد)

(ڕەحـمـەتـی خـوایان لـێ بێت) بـەم چـوارە دەوترێت پێشـەوای مـەزهـەبـەکـان و کـەسـیان هـاوەڵ نـەبون و تـەنها لـە شـوێنکـەوتوان و تابیعـی بوون.

---

## بەشـی دووەم

## (جۆرەکـانی ئاو و ئـەحـکـامـەکـانیان)

---

**پرسـیاری(١)**

پێناسـەی (الطهارة)پاکـکـردنـەوە لـەڕوی زمانـەوانی و شـەرعـی یـەوە چـی یە؟

**وەڵام:**

(الطـهارة)پاکـکـردنـەوە:

لـە ڕوی زمانـە وانی یـەوە، واتـە پاکـو خا وێنی و خـۆ پاراسـتنـە لـە بـێ دە سـت نوێژی و لـە ش گـرانی و لـە پیسـی.

لـە ڕوی شـەرعـەوە: بریتی یـە لـە لابردنی بـێ دە سـت نوێژی یان لابردنی پیسـایی لـە سـە ر پۆشـاك و جل و بـە رگ و لاشـە.

---

**پرسیاری(٢)**

حوکمی پاککردنە وە ( الطهارة) چی یە ؟

**وەڵام:**

حوکمی پاککردنە و ە بە کۆڕاو یەك دە نگی زانایان پێویست و واجبە.

---

**پرسیاری(٣)**

مانای ئاوی روت(ماء مطلق) چی یە و نمونە شی بۆ بێنە وە؟

**وەڵام:**

مانای ئاوی روت ئە و ئاوەیە کە ناوی ئاوی ڕوتی بۆ بەکار دەهێنرێت بێ هیچ ناو و ناتۆرەیەك، وە ك ئاوی بە فرو باران و دە ریا.

---

**پرسیاری(٤)**

بە چی ئاوێك دە وتریت ئاوی بەکار هاتو؟

**وەڵام:**

ئاوی بە کارهاتو بە و ئاوە دە وترێت کە بە کاریان هێناوە، بۆ نمونە وەك ئەو ئاوەی دەست نوێژی پێ گیراوە، مادەم بەکارهێنراوە پێی دەوترێت ئاوی بەکارهاتو.

---

**پرسیاری(٥)**

چی ئاوێك بە پیس دادەنرێت و نابێت بەکار بهێنرێت؟

**وەڵام:**

ئە و ئاوە ی کە تام و بۆن و ڕەنگی گۆڕاوەو لە بەری ناڕوات پێی دەوترێت ئاوی پیس و نەپاکەو نە پاك کەرەوەشە.

---

**بەشی سێ یەم**

**(پیسی و جۆرەکانی)**

---

**پرسیاری(١)**

(النجاسات) پیسی چی یە؟

**وەڵام:**

ئە و شتانەن کەدەبێت مرۆڤی مسولْمان خۆیانی لێ بپارێزن لە جل و بە رگ و پۆشاك و لاشە یان دا.

---

**پرسـیاری(٢)**

چـە نـد جـۆر ئـاو لـە زێ و داوێنـی ئـافـرەت یـان تـوڵـی پـیـاوەوە دەردەچـێـت، نـاوەکـانـیـان بـنـوسـە و کـامـانـەیـان پـیـسـن یـان پـاکـن ئـامـاژە یـان پـێ بـدە؟

**وەڵام:**

چـوار جـۆر ئـاو لـە زێـی ئـافـرەت یـان تـوڵـی پـیـاوەوە دەردەچـێـت کـە بـریـتـین لـە:

(مـەنـی، مـیـز، مـەزی، وەدی) تـەنـهـا ئـاوی مـەنـی پـاکـەو ، بـاقـی ئـاوەکـانـی تـری وەك مـەزی و مـیـزو وەدی پـیـسـن.

---

**پرسـیاری(٣)**

نـاوی ئـەو شـتـە پـیـسـانـە بـنـوسـە کـە لـەڕیـزی پـیـسـی یـەکـان دا بـاس کـراون لـە قـورئـان و سـونـنـەت دا؟

**وەڵام:**

دیـارە ئـەوشـتـانـەی کـەپـیـسـن دەبـێـت بـەبـەڵـگـەی قـورئـان و سـونـنـەت بـسـەلـمـێـنـرێـت و ئـەوانـیـش ژمـارەیـان زۆرەو لـەوانـەی کـە بـە پـیـس حـسـابـیـان بـۆ کـراوە(مـیـزو پـیـسـایـی مـرۆڤ. ،ئـاوی وەدی و مـەزی،خـوێـنـی سـوڕی مـانـگـانـەو پـاس مـنـاڵ بـونـی ئـافـرەت، گـۆشـتـی بـە راز،لـیـکـی سـەگ، مـیـزو پـاشـەڕۆی ئـەو ئـاژەڵانـەی کـە گـۆشـتـیـان نـاخـورێـت،ئـاژەڵـی مـردارەوەبـوو)

---

**پرسـیاری(٤)**

چـۆن خـۆمـان یـان کـەلـوپـەل و شـت و مـەکـەکـانـمـان ، لـەگـڵاوی سـەگ پـاك دەکـە یـنـەوە؟

**وەڵام:**

لـە کـوردەواری دا دەوتـرێـت دەبـێـت بـسـمـیـل بـکـرێـت، ئـەویـش بـەپـێـی دەقـی فـەرمـوودەی ڕاسـت و دروسـت حـەوت جـار ئـەشـۆردرێـت و یـەکـەم جـاریـان بـە گـڵ و شـەش جـارەکـەی تـریـان بـە ئـاو دەشـۆردرێـت و پـاك دەکـرێـتـەوە.

تـێـبـیـنـی: بـۆ پـاك کـردنـەوەی گـڵاوی بـەرازیـش بـەهـەمـان شـێـوە پـاك دەکـرێـتـەوە.

---

**پرسـیاری(٥)**

چـی مـردارەوە بـویـەك خـواردنـی گـۆشـتـەکـەیـان حـەڵاڵـە؟

**وەڵام:**

گـۆشـتـی مـاسـی و کـولـلـە، بـەمـرداربـونـەوەشـیـان گـۆشـتـەکـانـیـان حـەڵاڵـەو حـەرام نـابـێـت.

---

## بەشی چوارەم
## (پاككردنەوەی پيسی و ئەحكامەكانيان)

---

**پرسياری(١)**

بە گشتی شتی پيس چۆن پاك دەكرێتەوە؟

**وەڵام:**

هەموو شتێكی پيس بە ئاو پاك دە بێتەوە، گەر ئاويشمان دەست نەكەوت ئەوە خۆڵ يان بەردو هەرشتێك جێگەی ئاو بگرێتەوە دەتوانين پيسيەكانی پێ پاك بكەينەوە.

---

**پرسياری(٢)**

ميزی كورو كچی شيرە خۆرە، چۆن پاك دەكرێتەوە؟

**وەڵام:**

ميزی كوڕی شيرە خۆرە بە ئاو پرژاندن بەسەر ئەو شوينهی ميزەكەی كردووە پاك دەبێتەوە،بەڵام ميزی كچی شيرە خۆرە دەبێت شوێنەكەی بشۆردرێت و بەتەنها ئاو پرژاندن پاك نابێتەوە.

---

**پرسياری(٣)**

خوێنی سوری مانگانە و زە يستانی گەر بەر پۆشاك و جل و بەرگ كەوت، ئايا دەبێت ئەو پۆشاكە هەمووی بشۆردريت؟ يان چی لێ دەكرێت؟

**وەڵام:**

دە توانين بەس ئەو بەشەی بشۆرين كە خوێنەكەی بەركەوتووە بە جوانی بيشۆرين تا پاك دەبێتەوەو پێويست ناكات لەبەر ئەو پەڵە خوێنە هەموو پۆشاكەكە بشۆرين، وە ئەگەر پاش شۆرين شوێنەواريشی پێوە ما ئەوە پاكەو ئاساييە.

---

**پرسياری(٤)**

ئەگەر پۆشاكی ئافرە ت دامێنی لە زەوی خشاو پيس بو بە چی شتێك پاكی دە كە ينە وە؟

**وەڵام:**

ئەو پۆشاكە درێژەی ئافرەت كە لە زەوی دەخشێت ئەگە ر پيس بو ،هەر بەو خشاندنەی لە زەوی پاك دە بێتە وەو پێويست بەشۆردن بەئاو ناكات مەگەر ئافرەتەكە خۆی حەز بكات ئاوی پێدا بكات،

---

**پرسـیاری(٥)**

سـەر زەوی گـە ر میز یان پیسـایی تیادا کـرا چۆن پاك دەکـرێتە وەو لـە چـی کـاتێکـدا پێویسـتـی بە شـۆردن نیە؟

**وەڵام:**

دە توانین تەنهـا ئاو بکـەین بە شـوێنەکـەداو بیشـۆرین تا شـوێنەواری دیار نامێنیت و پاك دەبێتەوە، وە ئەگـەر تاقێك خۆر لـێی بدات ئەوا پاکـەو پاش وشـك بونەوەی شـوێنەکـە پێویسـت بە شـۆردنیش ناکـات.

---

**پرسـیاری(٦)**

پێشـەوا زەرکـەشـی(ڕەحمـەتـی خـوای لـێ بێت) دەفەرموێت ئەوەی لە لاشـەی مرۆڤ دێتە دەرەوە سـێ جـۆرن کـامانەن باسـیان بکـە؟

**وەڵام:**

جۆری یەکـەمیان پاکـەو بریتی یە لە(لیك ، چڵم ، ئارەق ، بەڵغـەم)

جـۆری دووەمیان پیسـەو هەمـوو شـەرع ناسـان لەسـەر پیسـێتیەکـەی ڕێك کـەوتون و بریتـی یەلە(پیسـایی ، میز، مـەزی، وەدی)

جـۆری سـێ یەمیان ڕاجیایی لـەسـەرەو کـۆمـەڵێك لـەشـەرع ناسـان دەڵێن: پاکـەو هـەندێکـی تریشـیان بەپیس ناویان هێناون، بەڵام ڕای ئەوانەیان پەسـەندترە کە بەپاك لەقەڵەمیان داوە ئەویش ئاوی(مـەنی)یە کـەپاکـە.

---

**پرسـیاری(٧)**

ئەگـەر ئاوی مـەنی بەپۆشـاکـەوە مایەوە، چۆن پاك دەکـرێتەوە، وە ڕای کـام لـەشـەرعناسـان پەسـەندترە لـەسـەر پیسـێتی و پاکـێتی ئاوی مـەنی؟

**وەڵام:**

ئاوی مـەنی ئەگـەر بە تەڕی بە پۆشـاك و جل و بەرگـەوە بێت باشـترە ئاوی پێدابکـرێت بشـۆردرێت، وە ئەگـەر وشـك ببۆیەوە بەدەسـت هەڵدەپروێنرێت و پێویسـت بەئاوکـردن بەسـەریشـیدا ناکـات.

سـەبارەت بەڕاجیایی زانایان و شـەعناسـان لـەسـەر پاکـێتی و پیسـێتی ئاوی(مـەنی) دەگـەڕێتەوە بۆ دوو ڕیوایەتی دایکـە عائیشـە(خـوای لـێ ڕازی بێت کـە لـە یەکـێکـیان دا دەڵێت: کـە ئاوی مـەنی پێغەمبەری خـوا(صلـى الله علیه وسلم) بە پۆشـاکـەکـەیەوە بووە شـۆردویێتی، لـەبەر ئەوە هەندێك لـەشـەرع ناسـان دەڵێن: دیارە پیسـە بۆیە شـۆردویەتی.

بەڵام لەڕیوایەتێکـی تردا هاتووە کـە تەنها هەڵیپرواندوە بەدەسـت و نەیشـۆردووە، لەبەر ئەم هۆکـارەیە کـە هەندێك لـەشـەرع ناسـانی تر ڕەددی کـۆمـەڵـی پێشـویان داوەتەوە دەڵێن:

ئەگەر پیس بوایە ئەوە تەنها هەڵی نەدەپرواندو دەیشۆرد، بۆیە ڕای دووەمیان پەسەندترەو بەوشێوەیە دەتوانین بڵێین ئاوی (مەنی) پاکەو، جیاوازە لە ئاوەکانی(مەزی، وەدی،میز) کە بەڵگەی پیسێتیان جیاوازی لەسەر نیە.

---

**پرسیاری(٨)**

لەچی کاتێکدا تەڕی و شێی داوێنی ئافرەت پیسەو، پێویست بە شۆردن و دەست نوێژگرتنەوە دەکات؟

**وەڵام:**

ئەو ئاوەی لە پێش جوتبون و کاری سەرجێی بەهۆی دە ست با زی یەوە دێتە دەرەوە لەداوێنی ئافرەت، یان بەهۆی وتەی ورووژێنەرو تەماشاکردنەوە دێتە دەرەوە، دەچێتە ڕیزی ئاوی(مەزی)و پیسەو دەبێت بشۆردرێت و دەستی تەڕیش بهێنرێت بە شوێنەوارەکەی داو دەست نوێژیش بگیرێتەوە.

---

**پرسیاری(٩)**

لەچی کاتێك دا تەڕی و شێی داوێنی ئافرەت پاکەو پێویست بە شۆردن و دەست نوێژ گرتنەوە ناکات؟

**وەڵام:**

تەڕی و شێی داوێنی ئافرەت لەکاتی ماندوبونی ئافرەت یان کاتی دووگیانی ئافرەت دا ، کە لەداوێنی دێتە دەرەوە زانایان ڕا جیان لەسەر حوکمەکەی، بەڵام ڕای پەسەندیان ئەوەیە کەوا ئەم تەڕی و شێ یە پاکەو هیچ مەترسی نیە لەسەر دەست نوێژی ئافرەت و پێویست بەهیچ ناکات.

---

**پرسیاری(١٠)**

فتوای شەرع ناسان و زانایان چی یە لەسەر پیسێتی یان پاکێتی شەراب، ناوی هەندێك لەو شەرع ناس و ئیمامانە بنوسە کە شەراب بە پیس لەقەڵەم دەدەن، وە ئەوانەشی شەراب بە پاك دەزانن و ڕای کامیشیان پەسەندترە؟

**وەڵام:**

هەر چوار پێشەواکەی ئیسلام لە مەزاهیبە بەڕێزەکان ، شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیەو ئیبنو حەزم(ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) ڕایان وایە کەوا شەراب پیسەو، پێ یان وایە کەوا بەر هەرشتێك بکەوێت شوێنەوارەکەی بشۆردرێت و پاك بکرێتەوە.

لەبەرامبەریشدا کۆمەڵێکی تر لە پێشینە چاکەکان و زانایان و شەرع ناسانی کۆن و نوێی وەك ، ڕەبیعەو، لەیس و، موزەنی و، داودی زاهیری و، شەوکانی و، سەنعانی و، ئەلبانی و، سەید سابق و ، ئال بەسسام و، ئیبن عوسەیمین(ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) بە پاکیان لەقەڵەم داوەو پێ یان وایە ئەوبەڵگانەی لەبارەی پیسێتی شەرابەوە هاتووە هیچیان مانای پیسێتی ناگەیەنن و ڕای ئەمانیش پەسەندترە.

---

**پرسیاری(١١)**

چی خوێنێك کۆڕای شەرعناسانی لەسەرە کە پیسەو هیچ خیلافێکی تێدا نیە؟، وە چی خوێنێکیش جیاوازی شەرع ناسانی لەسەرەو، ڕای کامیشیان پەسەندە ڕەحمەتی خوایان لێ بێت؟

**وەڵام:**

ئەو خوێنانەی کە بە پیس باسیان کراوە بەبەڵگەیەکی ڕون و ئاشکرا لەشەرع داو هیچ جیاوازیەکی زانایان و شەرع ناسانی لەسەر نیە، بریتی یە لە خوێنی(حیض) سوڕی مانگانەی ئافرەت و خوێنی(نیفاس) پاش منداڵ بونی ئافرەت.

سەبارەت بەو خوێنەی کەوا ڕا جیایی لەسەرە بە پیسێتی و پاکێتی لەخوێنی برینی مرۆڤ دا،دەکرێت بە دوو بەشەوە:

**یەکەم:** خوێنی (حیض) سوڕی مانگانەی ئافرەت و خوێنی(نیفاس) پاش منداڵ بونی ئافرەت، ئەمەیان پیسەو کەس ڕاجیا نیە لەسەری.

**دووەم:** خوێنی تری لاشەی مرۆڤ بێ لەو دوو خوێنەی سەرەوە، ئەمەشیان زۆرینەی شەرع ناسانی پێشو لەسەر پیسێتی کۆکن، بەڵام هەندێك لەشەرع ناسانی کۆن و نوێ و ئێستا پێ یان وایە ئەو بەڵگانەی باس لە پیسێتی خوێن دەکەن هیچیان مانای پیسێتی ناگەیەنن وچەندین بەڵگەی بەهێزمان لەبەردەستە کە هەر خوێنێك لەبرینی مرۆڤەوە بێت پاکەو پیس نیەو تەنها لەسەر ئەو خوێنە کۆڕان کە لەپاش و پێشی مرۆڤەوە دێتە دەرەوە چونکە بەر پیسی کەوتوە.

---

**پرسیاری(١٢)**

ئەوانەی کە ڕایان وایە خوێنی مرۆڤ پیسە بەڵگەیان چی یە لە قورئان و سوننەت دا؟

**وەڵام:**

ئەو زاناو شەرع ناسانەی کە خوێنی مرۆڤیان بەپیس لەقەڵەم داوە بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی کەخوای گەورە دەفەرموویێت: (قُل لَّا أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلَّا أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ ۚ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) (الأنعام:١٤٥)

واتە: (ئەی محمد (صلی اللە علیە وسلم) پێیان بڵێ: من نابینم و دەستم ناکەوێت لەوەی کە وەحی و نیگام بۆ کراوە هیچ خواردنێکی حەرام کراو لەسەر ئەو کەسەی کە بیخوات، مەگەر خواردنی مردارەوە بوو، یان خوێنێکی ڕژێنراو، یان گۆشتی بەراز، بەڕاستی ئەو قەدەغە کراوە هەر پیسە، یاخود(ماڵاتێک) کەلە سنووری شەرع دەرچووبێت لە سەر برینەکەیدا بەوەی کە ناوی غەیری خوای لەسەر برابێت، جا کەسێک ئەگەر ناچارکرا (بەهۆی گرانی یان زۆر لێکردن) لەکاتێکدا داواکارو دەرچوو نەبێت و بەردەوام نەبێت و دووبارەی نەکاتەوە، ئەوە بەڕاستی پەروەردگاری تۆ لێخۆشبوو میهرەبانە (بۆ براوادارانی ناچار).(تەفسیری ئاسان)

سەبارەت بە بەڵگەش لە سوننەت دا بێ لەڕای زۆرێك لە پێشەواو زانایان و شەرع ناسانی کۆن و نوێ ،فەرمووودەیەکی سەحیحمان لەبەر دەست دا نیە کەوا باس لە پیسێتی خوێنی برین و لاشەی مرۆڤ بکات بێ لە خوێنی سوڕی مانگانەو پاش منااڵ بون و پێش و پاشی مرۆڤ بێتە دەرەوە کە بە پیس حسابی بۆ کراوە بەڕونی.

---

**پرسیاری(١٣)**

ئەوانەی کەڕایان وایە خوێنی مرۆڤ پاکە بەڵگەیان چی یە؟

**وەڵام:**

بێگومان هەندێك لە توێژەرەوە گەورەکانی وك و ئیمامی(شەوکانی، سدیق خان، ئەلبانی،ئیبن عوسەیمین) (ڕەحمەتی خوایان لێ بیت) لەبەر ئەوەی لای ئەمان کۆڕای شەرعناسانی پێشینی لەسەر پێك نەهاتووە بەلایانەوە خوێن کەم بێت یان زۆر جاری بێت یان وشك هەر پیس نیەو بۆ بەهێز کردنی ڕاکانیان پشتیان بە کۆمەڵێك بەڵگەی بەهێز بەستوە، لەوانە ئەسڵی هەموو شتێك پاکیەو، تا بە بەڵگەیەکی رون لەسەر پیسێتیەکەی دەچەسپێت و دەردەکەوێت ، ئەوەی لە پێغەمبەری خواشەوە(صلی اللە علیە وسلم) گێڕدراوەتەوە ئەوەیە کەتەنها فەرمانی بە شۆردنی خوێنی سوڕی مانگانەو پاش منااڵ بون کردۆتەوەو لەکاتێکدا دەیان هاوەڵی بەڕێز لەخزمەتی دابون و سەدان جار خوێن بە پۆشاك و جل و بەرگ و لاشەیانەوە بوە لەچەندین ریوایەتی ڕاست و دروست دا هاتووە کەوا لەناو غەزاکان دا برینداربون و خوێنیان لێ ڕژاوەو بەر جل و بەرگ و پۆشاك و لاشەشیان کەوتووە نوێژیشیان پێوە کردووە نەشیان شۆردۆتەوەو دەست نوێژیشیان نەگرتۆتەوە بۆی ، ئەگەر خوێنیان بەپیس بزانیبایە بێ گومان فەرموودەیان لەوبارەیەوە پێ دەوتراو ئەوانیش بەویەری ئەمانەتەوە نقڵیان دەکرد تا بگات بەدوای خۆیان و ئێمەش لەم سەردەمەدا.

---

**پرسیاری(١٤)**

بەگشتی خوێنی ئاژەڵان دەکرێن بە چەند بەشەوەو چی و چین باسیان بکەو کامیشیان پاکەو کامیشیان پیسە؟

**وەڵام:**

خوێنی ئاژەڵ دەکرێت بە چوار بەشەوە:

**یەکەم:** ئەو ئاژەڵانەی کە گۆشتیان دەخورێت، شەرع ناسان دەفەرموون ئەم خوێنە پاکەو تەنها ئەو خوێنەی ئاژەڵەکە پیسە کە لەکاتی سەربڕینیان دا فیچقە دەکات و دێتە دەرەوە چونکە بەڵگەی پیسێتی هەیە لەسەری و هەندێکیشیان ئەویشیان بەپیس نەزانیوە وە ئیبن مەسعود(خوای لێ ڕازی بیت) خوێنی ئاژەڵی سەربڕاوی بە ئاستی بەر ورگیەوە بوەو لەدەست نوێژیشدا گوێی پێ نەداوە، بەڵام ئەوەی لەناو دەمارەکانیان دا یان گۆشتی ناو مەنجەڵ و قاپەکان دا دەمێنێتەوە پاکەو هیچی لەسەر نیە.

**دووەم:** ئەو ئاژەڵانەی کە گۆشتیان ناخورێت، شەرع ناسان دەفەرموون کەوا گۆشتی خوێنیان پیسە ، بێ لە خوێنی پشیلە ، چونکە پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی ، ئاساییەو پیس نیەو پشیلە لەوانەیە دەستەمۆن و ، بەردەوام دێنە لاتان.

**سێ یەم:** خوێنی ئەو گیان لەبەرانەی شەرعناسانی پێشین فەرموویانە خوێنی شلیان تێدا نیە، کە ئێستا پێ یان دەوترێت خوێنەکانیان سور نیەو زەرد باوە، بەهۆی نەبونی هیمۆ گلۆبینەوە لەخوێنیان دا ئەمانیش پاکن،وەك خوێنی مێش.

**چوارەم:** خوێنی ئاژەڵی مردارەوەبو کە وشك بۆتەوە، ئەو ئاژەڵانەی بی سەربڕینی شەرعی مردار بونەتەوە گەر بەر لاشە یان پۆشاك کەوت دەبێت پاك بکرێتەوە، تەنها ماسی و کوللە ئەو حوکمە نایان گرێتەوە چونکە فەرموودەی ڕاست و دروستیان لەسەرە والله اعلم.

---

**پرسیاری(١٥)**

ئەو شەرع ناسانەی کە پێ یان وایە شەراب پیسە بەڵگەی چی ئایەتێکی قورئان دەهێننەوە بینوسە لەگەڵ ماناکەی دا؟

**وەڵام:**

بەبەڵگەی ئەو ئایەتەی سورەتی کە وشەی(رجس) بەمانای پیسی هاتووە وەك خوای گەورە دەفەرموویت(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (المائدة / ٩٠)

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دڵنیابن کە عەرەق و قومارو گۆشتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری خوا لەو شوێنانەی کە خەڵک بەپیرۆزی داناوە نەک ئیسلام، بورج حەرام و حەڵاڵ زانین بەهۆی هەڵدانی زارەوە ئەمانە هەرپیسن و لەکاروکردەوەی شەیتانن، کەواتە ئێوەش خۆتانی لێ دوور بگرن و خۆتانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی سەرفرازیی و بەختەوەریی بەدەست بهێنن (لە هەردوو جیهاندا).(تەفسیری ئاسان)

ئەو زاناو شەرع ناسانەی کە شەراب بەپیس لەقەڵەم دەدەن دەفەرموون مانای شەی(رجس) بە مانای(نجس)دێت کە واتای پیسی دەگەیەنێت و بۆیە پی یان وایە گەر شەراب بەر هەر شوێنێکی مرۆڤ بکەوێت دەبێت بیشوات و پاکی بکاتەوە.

---

**پرسیاری(١٦)**

لە سێ شوێن و ئایەتی قورئان دا بێ لە ئایەتی سورەتی(المائدة/ ٩٠) کە وشەی(رجس) بەمانای پیسی هاتووە؟، بەڵام لەو سێ ئایەتەدا بەمانای تر دێت و ئایەتەکان و واتاکانیشیان بنوسەو لەچی سورەتێکی قورئانی پیرۆزیش دان؟

**وەڵام:**

**یەکەم:** سورەتی(الأنعام)خوای گەورە دەفەرموویت:(...كَذَلِكَ يَجْعَلُ اللَّهُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ) (الأنعام:١٢٥) واتە: ئا بەو شێوەیە خوای گەورە سزا بۆ ئەوکەسانە دادەنێ، کەباوەڕ ناهێنن، لێرەدا وشەی(رجس) بەمانای سزا هاتووە.

**دووەم:** سورەتی(التوبة)خوای گەورە دەفەرموویت (سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ إِذَا ٱنقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُواْ عَنْهُمْۖ فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمْۖ إِنَّهُمْ رِجْسٌۖ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ(التوبة:٩٥)

واتە: کە ئێوە گەڕانەوە (لە غەزا) بۆ لایان سوێندتان بۆ دەخۆن بە خوا بۆ ئەوەی وازیان لێ بهێنن و سەرزەنشتیان نەکەن، جا ئێوەش وازیان لێ بهێنن و پشتیان تێبکەن، چونکە بەڕاستی ئەوانە (دڵ و دەروون) پیسن، شوێن و جێگەیان دۆزەخە لە پاداشتی ئەو کارو کردەوەی کە دەیانکرد. لێرەدا وشەی(رجس) بەمانای پیسێتی و کردەوەی بەدیان هاتووە.

سێ یەم: سورەتی(الحج)خوای گەورە دەفەرموویت(... فَٱجْتَنِبُواْ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ ...) (الحج:٣٠) واتە: توخنی بتە پیسەکان مەکەون، چونکە دەبنە مایەی سزاو ئەشکەنجەی دوایی، نەك خۆیان پیس بن وەکو پیسایی ، چونکە بەرد لە ئەسڵ دا پیس نی یە.

لەوەڵامی بەڵگەی ئایەتەکەی سورەتی(المائدة)یش دا دەفەرموون: وشەی(رجس) مانای تری زۆرە وەکو (پیسایی ، حەرام کراو، ناشرین، سزا، لەعنەت، کوفر، خراپەکاری، تاوان و گوناح،، ئیتر چۆن تایبەت دەکرێت بە پیسی یەوە بەتەنها؟.

---

**پرسـيارى(١٧)**

ئايا ڕشـانەوە پيسـە يان دەسـت نوێژ دەشـكـێنێت؟ وە لـەچـى كـاتێكـدا ڕشـانەوە ڕۆژوو دەشـكـێنێت و لـەچـى كـاتێكـيشـدا ناى شـكـێنێت؟

**وەڵام:**

حوكمـى ڕشـانەوە پاكـەو ئەو بەڵگـەى فـەرمووديەى هاوەڵـى بەڕێز عـەممارى كـوڕى ياسـر(خـواى لـێ رازى بێت) كـە ڕشـانەوەى بەپيس باس لـێوە كـردووە، ئەگـەر چـى هـەنديك لـەشـەرع نـاسـان پشـتـى پـێ دەبەسـتـن بەلام زانايانـى فـەرموودە نـاس بە لاوازيان لـەقـەڵـەم داوەو پشـتـى پـێ نابەسـترێت و بەو هۆيەشـەوە پيس نيەو دەسـت نوێژيش ناشـكـێنێت و نوێژى پێوە دروسـتە، بەلام گـەر بشـۆرێت و پاك بـكـرێتەوە باشـترە، چـونكـە ڕشـانەوەى هـەموو كـەسـێك بۆنێكـى ناخۆشـى لـێ دێت و خـودى كـەسـەكـەش و دەوروبەريشـى بێزاردەكـات.

سـەبارەت بە ڕۆژوو شـكـاندنيش هـەركـاتێك مرۆڤ بەدەسـتـى ئەنقـەسـت خـۆى ڕشـاندەوە ئەوە ڕۆژووەكـەى دەشـكـێت بەلام ئەگـەر ڕشـانەوەكـە بەبـێ ويسـت و ئارەزوو دەسـتـى خـۆى بێت ئەوە ڕۆژووەكـەى دروسـتـەو هـيچ كـاريگـەريەكـى نـى يە لـەسـەر ڕۆژووەكـەى و ناشـكـێت و لاى خـوا قـبولـەو با بەردەوام بێت لـەسـەرى إن شـاء ألله.

---

**پرسـيارى(١٨)**

كـاتێك مێشـێك كـەوتە ناو خـواردن يان خـواردنـەوەمان دەبێت چـى بـكـەين لـەوكـاتـەدا؟، وە ئايا ئەو خـواردن و خـواردنـەوەيە پيس دەكـات؟

**وەڵام:**

هـەركـاتێك مێشـێك كـەوتە ناو قـاپـى خـواردنمان يان چـاو شـەربەتـى ناو پيالـەو پەرداخـمان ئەو بە پەنجە بەتـەواوى نوقـمـى دەكـەين و پاشـان خـواردن و خـواردنـەوەكـەمان تـەواو دەكـەين ، هۆكـارى ئەو نوقـم كـردنەش بۆ ئەوە دەگـەڕێتەوە كـەوا مێش باڵێكـى نەخـۆشـى پێوەيەو باڵـەكـەى تريشـى شـيفـايەو ئەو نەخـۆشـيـە لـەناو دەبات ، كـاتێك دەكـەوێتـە ناو خـواردن و خـۆراكـمانەوە بەو باڵە دەكـەوێتـە ناوى كـەوا نەخـۆشـى پێوەيەو بە باڵـەكـەى ترى شـيفـايەو نەخـۆشـيـەكـە لـەناو دەبات، ئەم فـەرموودەيەش يەكـێكـە لـەو فـەرموودە ئيعـجـازيانەى كـە لـەلايەن زانسـتـى پزيشـكـى سـەردەمـەوە سـەلـمێنراوە.

---

**پرسـيارى(١٩)**

چەند جۆر بەکتریا لەباڵی مێش دا دەژین و خراپەکانی دەبنە هۆکاری چی لەلاشەی مرۆڤ دا؟

**وەڵام:**

بەپێی توێژینەوەی پزیشکانی بەڕێز لەو بوارەدا نۆ جۆر بەکتریا لەباڵی مێش دا دەژی ، هەندێکیان بە سالب و خراپ و هەندێکیشیان بە موجەب و باش دەناسرێن، گەر بەو شێوەی فەرموودەی باسی پێشەکە دەکات لەکاتی کەوتنە ناو خواردن و خواردنەوەکانمان نقوم نەکرێن، ئەوە دەبنە هۆکاری نەخۆشی(چاو ئاوسان و دوومەڵ و ئاوسانی میزەڵان و کلێنچکەو دەرچەی کۆم و دەزگای میز و پیس کردنی خۆراکیش)

---

**پرسـيارى(٢٠)**

ئەو بڕە پیسیەی کە لەشەرع دا چاو پۆشی لێکراوە کامەیە؟

**وەڵام:**

شەرع ناسان زۆر لەم باسەدا ڕاجیان ، لەجۆرو بڕی پیسیەك کەدەبێ عەفوی لێ بدرێت، بەڵام ڕای پەسەند دەگەڕێتەوە سەر جۆری پیسیەکەو توانای پاك کردنەوەی کەسەکە کە بتوانێت ڕەنگ و بۆن و شوێنەواری لابدات بەپێی تواناو ، چەندێك توانی پاکی بکاتەوەو باقیەکەشی کە توانای لادانی نیە ئەوە قەڵەمی عەفوی لێ دراوە بەپشتیوانی خوا والله أعلم.

---

## بەشی پێنجەم
## (ئەحکامی دەست بە ئاو گەیاندن)

---

**پرسـيارى(١)**

پێناسەی تارەت گرتن چی یە لەڕوی زاراوەیی و زمانەوانی یەوە؟، وە حوکمی تارات گرتن چی یە؟

**وەڵام:**

لەڕوی زارەوەییەوە: بریتیە لەلابردنی هەرشتێك کە لەکونی پاش و پێشی مرۆڤ هاتبێتە دەرەوە جا بە ئاو یان هەرشتێك شەرع ڕێی پێ داوە پاك دەکرێتەوە.

لەڕوی زمانەوانیەوە(إستنجاء) واتە: برینەوە.

حوكمی تارەت گرتن لای كۆڕای مەزاهیبەكان ، كە دەكاتە سێ مەذهەب واجبە، جگە لە مەذهەبی ئیمامی حەنەفی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت)كەپێی وایە سونەتە.لای ئەوانی تر واجبە كە پیسی و میزو مەزی و ئەوەی بەپیس حسابی بۆكراوە تارەتی بۆ بگیرێت و خۆمانی لێ پاك بكەینەوە.

---

**پرسیاری(٢)**

دەبێت بەچی و چی خۆمان پاك بكەینەوەو لەچی و چیش خۆمان بپارێزین تەنها ناوەكانیان بنوسە؟

**وەڵام:**

تارەت گرتن بە ئاو و یان سێ بەرد، یان كلێنس و هاوشێوەی ئەو شتانەی كە ئێستا بەكاردێت بۆ خۆ پاككردنەوە.

وە ئەبێت خۆمان بپارێزین لە ئێسكی ئاژەڵ و تەرس و تەپاڵەو گەڵاو هاوشێوەكانیان جائیزنیە تاراتی پێبكرێت.

---

**پرسیاری(٣)**

زیكری چونە سەر ئاو و هاتنە دەرەوە چین بیان نوسە؟

**وەڵام:**

زیكری چونە سەرئاو كە سەرەتا بە قاچی چەپ دەچینە ژورەوەو پاشان دەڵێین:(بِسْمِ اللّٰهِ)

وەلەكاتی دەكەندنی پۆشاك دا لە سەرئاوەكە دەڵێین: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الخُبُثِ والخَبائِثِ) . واتە: (بەناوی خودا دەچمە ژورەوە، خودایە من پەنات پێ دەگرم لە شەیتانە نێر و مێینەكان)

وە كاتێكیش دێینە دەرەوە قاچی ڕاستمان پێش دەخەین و دەڵێین: (غُفْرانَكَ)

واتە: (خودایە داوای لێ خۆشبوونت لێدەكەم، چونكە ئەم ماوەیە دوور بووم لە یاد و زیكری تۆ) .

---

**پرسیاری(٤)**

ئادابەكانی تارات گرتن چین تەنها بەخاڵ بیان نوسە؟

**وەڵام:**

ئادابەكانی چونە سەر ئاو بریتین لە:

* دوركەوتنەوە لەبینینی خەڵك ئەگەر لە دەشت بوو، بنچینە ئەوەیە كەس نەیبینێت.
* باشتر وایە هیچ شتێك لەگەڵ خۆی نەباتە سەرئاو، كە زیكر یان قورئان یان فەرموودەی لەسەربێت، بەڵام گەر بیشیبات و پیسی بەرنەكەوێت ئاساییە.

* خوێندنی زیکرەکانی تایبەت بە چونە سەرئاو.
* چوونە ژوورەوە بە قاچی چەپ و هاتنە دەرەوە بە قاچی ڕاست.
* ئەگەر لە دەشت و دەر بێت نابێت ڕووی لە قیبلە یان پاشی لەقیبلەبێت.
*خۆگرتنەوە لەقسەکردن و سەلام کردن و زیکرکردن.جگەلەکاری گرنگ.
* خۆ پاراستن لەدەست بەئاوگەیاندن لەسەرە ڕێی خەڵك و سێبەری خەڵك و سەر کانی و ئاوی خواردنەوەی خەڵك.
* میزنەکردنە ئەو شوێنەی خۆی لێ ئەشوات ئەگەر ئاوەکەی دەرنەچێت و کونجی نەبێت.
* میزنەکردنە ناو ئاوی وەستاو ئاوی جاریە کە بۆ کشتوکاڵ بەکاردێت واتە: شتی لێ ڕووا بێت.
* هەڵبژاردنی شوینی فشەڵ و فراوان تا پرژی میز بەرزنەبێتەوەو پیس بێت.
* میزنەکردنە کونی دارو بەرد بۆ ئەوەی نەوەك گیانداری طیدابێت ئازاری بدات یان دواتر گیاندارەکە ئازاری کەسەکە بدات.
* خۆ پاك کردنەوە بەدەستی چەپ و بەدەستی ڕاست تارات نەگرێت.
* عەورەتی بەدەستی ڕاستی نەگرێت و پاش و پێشی خۆی بەجوانی پاك بکاتەوە.
* ڕژاندنی کەمێك ئاو بەعەورەت دوای خۆ پاك کردنەوە بۆ زیاتر دڵنیایی.
* دوای تارات گرتن باش وایە دەست بە ئاو و صابون یان خۆڵ پاك بکرێتەوەو بشۆردرێت.

---

**پرسیاری(٥)**

حوکمی میزە چورکێ و خوێنی کاتی ئافرەتان(استحاضة) چی یە؟ بۆ دەست نوێژ گرتنەوەی نوێژە فەرزەکان؟

**وەڵام:**

ئەو کەسەی توشی میزە چورکێ بووە ئەبێت بۆ هەموو نوێژێکی فەرزی دەست نوێژ بگرێت و تارات بگرێتەوە، بەڵام هیچ کێشەیەك نیە ئەگەر لەوکاتەی دەست نوێژەکەی گرتوە هەست بەتەڕی میزە چورکێکە بکات لەکاتی نوێژەکەشی دا نایبرێت و بەردەوام دەبێت لەسەر نوێژەکەیی و هەموو نوێژە سوننەتەکانی پاش و پێشی ئەو نوێژە فەرزەشی لەگەڵ دا دەکات بەبێ ئەوەی ترسی شکانی دەست نوێژەکەی هەبێت.

بۆ خوێنی نەخۆشی کاتی(استحاضة)ی ئافرەتانیش هەروەك حوکمی میزە چورکێکە وایە ئەبێت بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژ بگرێتەوە.

---

## بەشی شەشەم
## (سوننەتە سروشتیەکان)

---

**پرسیاری(١)**

مەبەست سوننەتە سروشتیەکان واتای چی دەگەیەنێت؟

**وەڵام:**

بریتیە لەو ڕەفتارانەی کە هەرکەسێك بیانکات بەخاوەنی ئەوسروشتە ئەزانرێت کەخوای گەورە مرۆڤی لە سەر دروست کردووە، ئەوڕەفتارانەش ئەوانەن کە خوای پەروەردگار خۆشی ئەوێن وکردوێتی بە سیمای هەموو پێغەمبەران(علیهم أفضل الصلاة والسلام)هەتاوەکو بەسیفاتی نمونەییەوە دەربکەون بۆخەڵك و گەلەکانیان کەئەوسیفەتانەش هەرلەکۆنەوە یاساو ڕێنمایی دینیان دەربارەی داڕێژراوە هەتا بوونەتە سیفەتی سروشتی کەسانی ئیماندار.

---

**پرسیاری(٢)**

ئەو فەرموودەیەی دایکە عائیشە(خوای لێ ڕازی بێت) کە دە سوننەتی سروشتیمان بۆ باس دەکات ، ئەو سوننەتانە چین بیان نوسە بەخاڵ؟

**وەڵام:**

١. سمێڵ کورت کردنەوە.
٢. ڕیش هێشتنەوە.
٣. سیواك کردن.
٤. ئاوڕادان لە دەم.
٥. نینۆک کردن.
٦. شتنی چرولۆچی بۆشایی لاشە.
٧. هەڵکەندنی مووی بن باڵ.
٨. تاشینی مووی پێش وپاش.
٩. بەکار هێنانی ئاو بۆتارات گرتن.
١٠. ئاوڕادان لە لوت.

---

**پرسـیاری(٣)**

حوکمی خەتەنەکردنی پیاو و ئافرەت چی یە؟

**وەڵام:**

پاش لێکۆڵینەوە لەسەرجەم ڕاو بۆچونی شەرع ناسان ئەوەمان بۆ ڕون دەبێتەوە کەوا خەتەنەکردن بۆ پیاوان فەرزەو واجبە، بەڵام خەتەنە کردن بۆ ئافرەتان نە فەرزەو نەواجبەو نە سوننەتیشە بەڵکو بەتەنها پەسەندەو مەرج نیە بکرێت، بەتایبەتی بۆ ناوچەی کوێستان و سارد ، چونکە بەهۆی زۆر برینی ئەو پارچە گۆشتەی میتکەی ئافرەتەوە کار لە شەهوەت و ئارەزووی ئافرەتەکە دەکات،کە بەداخەوە زۆرجار بوەتە هۆکاری کێشەی گەورەی خێزانی و جیابونەوەی ژن و مێردو ئافرەتانی واش هەیە کە خاوەنی چەندین منداڵیشن بەلاَم نە خۆیان ئارەزوویان هەیە بۆ سەرجێی نە دەتوانن مافی هاوسەرەکانیشیان بدەن، بۆیە داواش کراوە لە دەقی فەرموودەدا گەر کراش لەناوچە گەرمەکان دا کەمی لێ ببڕدرێت.

---

**پرسـیاری(٤)**

ئەوکاتانەی بەکار هێنانی سیواک پاداشتی زیاترە، چی کاتێکن؟

**وەڵام:**

سیواک کردن لە هەموو کاتێکدا سوننەتەو ئەگەر لەبەر ئەوەش نەبوایە کە قورس دەبێت لەسەر شانی نەتەوەی ئیسلام ئەوە پێویست دەکرا لەسەرمان، لەبەر ئەو هەموو تایبەت مەندیە چاك و باشەی لەڕووی زانستی سەردەم و تەندروستیشەوە سەلمێنراوە، بەلاَم لەم کاتانەدا پاداشتیان زیاترە ئەوانیش بریتین لە:(کاتی دەست نوێژ گرتن ـ کاتی نوێژ کردن ـ کاتی قورئان خوێندن ـ کاتی چونە ماڵەوە ـ کاتی هەستان لەخەو بۆ شەونوێژ)

---

**پرسـیاری(٥)**

دەبێت کردنی نینۆك و هەڵکەندنی توکی بن باڵ و تاشینی موی پێش و پاش لەچەند ڕۆژ زیاتر تێ نەپەڕێت؟

**وەڵام:**

بەپێی فەرموودەی ڕاست و دروست هاتووە کە جائیز نیە لە (٤٠) ڕۆژ زیاتر تێ بپەڕێت و دەبێت لایەنی کەمی لەماوەی هەموو(٤٠) ڕۆژ جارێکدا لاشە پاك بکرێتەوە لە نینۆك و هەڵکەندنی توکی بن باڵ و تاشینی موی پێش و پاش.

---

## بەشـی حەوتەم
## (دەست نوێژگرتن و ئەحكامەكانی)

---

**پرسـیاری(١)**

پێناسـەی دەست دەست نوێژ بكە لەڕوانگەی زاراوەییەوە؟

**وەڵام:**

دەست نوێژ: بریتیە لەبەكارهێنانی ئاو بۆهەندێك لە ئەندامی جەستەو لاشەی مرۆڤ وەك دەست ودەم وچاوو، مەسحی سەروو،شۆردنی پێكانە هەتا قولەپێ، تاوەكو ڕێی نوێژكردن وخواپەرستی تری پێ بكرێتەوە.

---

**پرسـیاری(٢)**

هەندێك فەزڵی دەست نوێژ بنوسە بەكورتی؟

**وەڵام:**

هەندێك لە فەزڵەكان و گەورەیی دەست نوێژ بریتین لەوەی:

١. دەست نوێژ نیوەی ئیمانە.
٢. دەست نوێژ گوناهە بچوكەكان دەسڕێتەوە.
٣. دەست نوێژ پلەوپایەی خاوەنەكەی بەرز دەكاتەوە لای خوای گەورە وەهەروەها دەست نوێژ گرێ كوێرەی شەیتان ئەكاتەوە.
٤. دەست نوێژ ڕێی چونە بەهەشتە.
٥. دەسی نوێژ نیسانەی ناسینەوەی ئەم ئوممەتەیە.
٦. دەست نوێژ لەڕۆژی دوایی دا دەبێتە مایەی نورانێتی مسولمانان.

---

**پرسـیاری(٣)**

ئەو ئایەتە ی باسی دەست نوێژ دەكات لەچی سورەتێك دایە؟ ژمارەی ئایەتەكەش چەندە؟

**وەڵام:**

سورەتی (المائدة) لە ئایەتی (٦)دا وەك خوای گەورە دەفەرموویێت(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ...)واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: كاتێک ویستتان هەستن بۆ نوێژ (پێش ئەوە دەست نوێژ بگرن، بەم شێوەیە): ئەوە سەرەتا ڕووخسارتان بشۆن، ئینجا دەستەكانتان لەگەڵ ئەنیشكتاندا، پاشان دەستی تەڕ بهێنن بەسەر سەرتاندا، قاچەكانیشتان بشۆن لەگەڵ قولە پێتاندا...

**پرسیاری(٤)**

شوێنی نیەت هێنان کوێ یە؟، ئەو فەرموودەیە بنوسە کە نیەت هێنان بە مەرجی عیبادەت باس دەکات؟

**وەڵام:**

شوێنی نیەت هێنان (دڵە) و مەرجە بۆ خواپەرستی و پێویست ناکات بەدەم نیەت بهێنین بۆ خواپەرستیەکان ، وە پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: (إِنَّمَا الأَعمالُ بالنِّيَّات، وإِنَّمَا لِكُلِّ امرئٍ مَا نَوَى ...)

واتە: هەموو کردەوەیەك بەپیی نیەتە، نیەتی هەرکەس چۆن بو. هەر ئاوا بۆی دەنوسرێت...

---

**پرسیاری(٥)**

پێناسەی (ڕوکن) پایە چی یە؟

**وەڵام:**

واتە: ئەنجام دانی ئەو کردەوانەی کە بەکردنیان پاداشت وەردەگرین و بەنەکردنیان پەرستشەکەمان بەتاڵ دەبێتەوە، ئەویش بۆ نمونە بریتەلەو ڕەفتارانەی کەبەهەموویان حەقیقەتی دەست نوێژ پێك دەهێنێت، وەئەگەر یەکێکیان نەکرێت ئەوا دەست نوێژەکە بەتاڵ ئەبێتەوە، وەك نەشۆردنی دەم و چاو هەردوو دەست تا ئەنیشك و یان مەسحی سەرو گوێ یان شۆردنی پێ یەکان تا قولەپێ و بەجێ هێنانەی ئەم ئەرکانە بە ڕیز بەدوای یەکدا بێ پاش و پێش کردنیان لەکاتی دەست نوێژدا!.

---

**پرسیاری(٦)**

پێناسەی (واجبات) پێویستی چی یە؟

**وەڵام:**

واتە: ئەنجام دانی ئەو کردەوانەی بەئەنجامدانی پاداشت وەردەگرین و بەئەنجام نەدانی بە ئەنقەست تاوان بار ئەبین لە ڕوانگەی شەرعیەوە بەڵام پەرستنەکە بەتاڵ ناکاتەوە ئەگەر یەکێك لەواجبەکان ئەنجام نەدرێت.

---

**پرسیاری(٧)**

پێناسەی سوننەت و حوکمی ئەنجام دان و نەکردنی سوننەت چی یە؟

**وەڵام:**

هەر کارو کردەوەیەك و فەرمایشتێك لە پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) بینرابێت یان بیسترابێت پیی دەوترێت سوننەت ، وە حوکمەکەی بەکردنی پاداشت وەر دەگرین و بە نەکردنی تاوان بار نابین.

**پرسیاری(٨)**

بەکورتی پایەکانی دەست نوێژ بژمێرە؟

**وەڵام:**

١. شۆردنی دەم و چاو.

٢. شۆردنی دەست تا ئەنیشك.

٣. مەسحی سەرو گوێ یەکان.

٤. شتنی پێکان تا قولە پێ

٥. ڕیز بەندی ڕەفتارەکانی دەست نوێژ یەك لەدوای یەك

٦. لەکاتێکداو یەك لەدوای یەك ڕەفتارەکان ئەنجام بدرێت و بەشێکیان نەکرێت و باقیەکەی بۆ کاتێکی درەنگ دوابخرێت.

---

**پرسیاری(٩)**

بەکورتی پێویستیەکانی دەست نوێژ بژمێرە؟

**وەڵام:**

١. دەست پێکردن بەناوی خوا(بسم الله)کردن.

٢. شۆردنی هەردوو لەپ پێش ئەوەی بیکاتە ناو ئاوی دەست نوێژەوە ، ئەگەر لەخەو هەستا.

٣. ئاو ڕادان لە دەم و لوت دەرکردنەوەی.

٣. شتنی ڕیش و برۆی پڕ.

٤. شتنی بەینی پەنجەکانی قاچ بە پەنجە توتە یاخود بە پەنجەکانی دەستی چەپ.

پێویستیەکانی دەست نوێژ ئەگەر پاشو پێش بخرێت کێشەی نیە.

---

**پرسیاری(١٠)**

بەکورتی سوننەتەکانی دەست نوێژ بنوسە؟

**وەڵام:**

١. شۆردنی هەردوو لەپ بۆ هەموو دەست نوێژێك.

٢. سیواك کردن.

٣. شۆردنی ئەندامانی لاشە سێ جار سێ جار.

٤. ئاولە دەمو لوت ڕادان بەیەك چنگی دەستی ڕاست و پاککردنەوەشی بەدەستی چەپ بەزۆری جگە لەوکاتەی بەڕۆژووین دەبێت کەمی بکەینەوە.

٥. پێش خستنی ئەندامی ڕاست دواتر ئەندامی چەپەکان.

٦. شۆردنی دەم و چاوو، دەست و پێ لەسنووری خۆی زیاتر.

٧. خوێندنی دوعای دوای دەست نوێژ کە بریتی یە لەم زیکرانەی خوارەوە:
ئیمامی عمر (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) ئەگێڕێتەوە، کە فەرمویەتی ئەوەی دەست نوێژی پاك بشوات و ئەم نزایە بخوێنێت ( أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اَللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ, وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ, " اَللَّهُمَّ اِجْعَلْنِي مِنْ اَلتَّوَّابِينَ, وَاجْعَلْنِي مِنْ اَلْمُتَطَهِّرِينَ " ) واتە: (شایەتی دەدەم بەوەی، کە هیچ پەرستراوێک شایستەی پەرستن نییە بەڕاستی، جگە لە (الله)ی تاکی بێ هاوەڵ، هەروەها شایەتی دەدەم بەوەی، کە بەڕاستی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بەندە و نێردراوی خودایە)"(خودایە بمگێڕە لە بەندە تەوبە کارەکان و بەندە خۆ پاککەرەوەکان).
خوای گەورە هەموو دەرگاکانی بەهەشتی بۆدەکاتەوە لەهەر کامیانەوە بیەوێت ئەچێتە ژوورەوە.
وە دوعای (سبحانك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ, أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ) .
واتە: (خودایە پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ تۆ، شایەتی دەدەم بەوەی، کە هیچ پەرستراوێک شایستەی پەرستن نییە جگە لە تۆ، داوای لێخۆشبونت لێدەکەم و بۆ لای تۆش دەگەڕێمەوە) ، لەسەر لەوحێك دەنوسرێت مۆر ئەکرێت و هەڵ ئەگیرێت هەتا ڕۆژی قیامەت.
٨. کردنی دوو ڕکات نوێژی دەست نوێژ لەپاش دەست نوێژگرتن.

---

**پرسیاری(١١)**
پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) چۆن ئوممەتەکەی دەناسێتەوە لەڕۆژی دوایی دا؟
**وەڵام:**
بە شوێنەواری دەست نوێژەکانیان و ئەو شوێنانەی لەکاتی دەست نوێژدا ئەشۆردرێن نوریان لێ ئەبارێت و دەبنە هۆی ناسینەوەی موسڵمانان.
پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویت: ئوممەتەکەی من لە ڕۆژی دوایی دا ناوچەوانیان نورانیەو قۆڵ و باسکیشیان سپی یەو نوریان لێ دەبارێت هەمووی شوێنەواری دەست نوێژە.

---

**پرسیاری(١٢)**

حوکمی نینۆك بۆیەکردن و میکیاج کردن چی یە لەکاتی دەست نوێژدا؟

**وەڵام:**

ئەگەر ئافرەتان دەست نوێژ بە میکیاج و بۆیەی نینۆکەوە بگرن، ئەوا ئەو دەست نوێژە یان بەتاڵەو دروست نیە چونکە ئەو شوێنی بۆیەو میکیاجە تەڕ نابێت، لەکاتێکدا تەڕبونی هەموو شوێنەکانی لاشە بۆ دەست نوێژ، یەکێکە لە پایەکانی دەست نوێژ، کەوابوو باشترە دوای دەست نوێژ ئەمانە بکرێت یان لەکاتی سوڕی مانگانەو پاش منداڵ بون دا ، تا ئافرەتان پاك دەبنەوە دەتوانن پێوەیان بمێنێتەوە بەومەرجەی پیاوانی نامەحرەم نەیان بینن.

---

**پرسیاری(١٣)**

ئەو شتانەی دەست نوێژ دەشکێنێت بەکورتی هەموویان بنوسە؟

**وەڵام:**

١. هاتنە دەرەوەی میزو پیسایی لە پێش و پاشەوە، یان دەرچونی بای دەنگدارو بێ دەنگ ،وە ئەگەر کون کرابێتە ریخۆڵەوەو بای لێ بێت یان پیسایی  ئەویش دەست نوێژ دەشکێنێت، چونکە ریخۆڵە پیسای و بای تیادا کۆ دەبێتەوە.

٢ـ هاتنە دەرەوەی ئاوی مەنی و مەزی و وەدی.

٣ـ خەوێك بێ هۆشی دروست کردبێت.

٤ـ لەهۆش خۆ چوون بەشێت بوون یان بورانەوە یان سەرخۆشی.

٥ـ دەست دان لە زەکەرو عەورەت بەڕووتی و بەئەنقەست.

٦ـ وە ژنیش دەست لەعورەتی خۆی بات دەست نوێژی شکاوە.

٧ـ خواردنی گۆشتی حوشتر.

---

**پرسیاری(١٤)**

حوکمی دەست بەرکەوتنی زەکەرو تولَی پیاو، وە زێ و داوێنی ئافرەت چی یە؟

**وەڵام:**

حوکمی دەستدان لە زەکەری پیاو ئەگەر بێت و بە ویستی خۆی بێت و بە چێژەوە دەستی لێبدات دەست نوێژ ئەشکێنێ، بەڵام ئەگەر بەبێ ویستی خۆی بێت یان لەکاتی جل و بەرگ گۆڕینا ،دەست نوێژی ناشکێنێ،وە سەبارەت بە ئافرەتیش گەر دەستی بەر عەورەت و داوێنی بکەوێت دەست نوێژی شکاوە چونکە بەڵگەی زۆر هەیە لەسەر شکانی دەست نوێژەکەی لەوانەش فەرموودەی دایکە عائیشە خوای لێ رازی بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا هەندێك لەزانایان دەفەرموون جیاوازی نیە لە نێوان پیاو و ئافرەت گەر بە ئارەزووەوە بوو ئەوە دەشکێت و گەر بە ئارەزووش نەبێت هیچیان دەست نوێژیان نەشکاوە.

**پرسیاری(١٥)**

لەکاتی گۆڕینی دایبی و حەفازەی منالّ پێویست دەکات ئافرەتان چی بکەن بۆ دەست نوێژەکەیان؟

**وەڵام:**

لەکاتی پاککردنەوەو گۆڕینی دایبی و حەفازەی مندالّ دا، ئەگەر دایکان لەوکاتەدا دەستیان بەر پیسایی و پاش و پێشی مندالّەکانیان کەوت،تەنها دەستیان دەشۆن و گەر دەست نوێژیان هەبێت دەست نوێژەکەیان دروستەو ناشکێت.

---

**پرسیاری(١٦)**

مانای ڕووداوی بچوك(حدث الأصغر) و ڕووداوی گەورە(حدث الأكبر) چین؟

**وەڵام:**

ڕووداوی بچوك(حدث الأصغر) ئەو ڕووداوەیە کە مانای دەست نوێژ شکاندن دەگەیەنێت و پێویستە لەگەڵ ڕوودانی دا دەست نوێژ بگیرێتەوەو پێویست بە خۆشۆردن(غوسڵ) ناکات،. وەك ڕوودانی یەکێك لەوشتانەی دەست نوێژ دەشکێنێت.

ڕووداوی گەورە(حدث الأكبر) ئەو ڕووداوەیە کە مانای سەرجێی و لەش گرانی دەگەیەنێت و پێویستە لەگەڵ ڕوودانی دا خۆشۆردن(غوسڵ)ی بۆ ئەنجام بدرێت. وەك ڕوودانی یەکێك لەوشتانەی کە خۆشۆردن(غوسڵ)پێویست دەکات.

---

**پرسیاری(١٧)**

ئایا دەست بەرکەوتنی نێوان ژن و مێرد دەست نوێژ دەشکێنێت؟، ئەگەر بەڵێ یان نەخێر بەچی بەڵگەیەك و هۆکاری جیاوازیەکە چی یە لەنێوان زانایان و شەرع ناسان و مەزاهیبەکان دا؟

**وەڵام:**

بەپێی وەرگرتنی بەڵگە بەهێزەکان قورئان و فەرموودەو، ڕای هاوەڵان و شەرع ناسان و کۆڕای مەزاهیبە بەڕێزەکان بێ لە پێشەوا شافیعی(ڕەحمەتی خوایان لێ بێت)نەخێر بەرکەوتنی نێوان ژن و مێرد بەڕوتی دەست نوێژ ناشکێت.

ئەویش بەبە ڵگەی زۆری ئەو فەرموودانەی کە دایکە عایشە(خوای لێ رازی بێت) بۆمان باس دەکات و دەگێڕێتەوە کەوا شەویکیان پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لە لایەوە نەماوەو دواتر کە گەشتۆتە لای پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)لەکاتی سوجدە بردن دا بوەو ئەویش دەستی داوە لە پاژنەی پێی و دواتریش دەست نوێژی نەگرتۆتەوە، یان لەڕیوایەتی تردا دەفەرموویێت: ماچی خێزانەکانی کردوەو نوێژی کردووە بەڵام ئەو لە ئێوە خۆراگرتر بووە، وەبەڵگەی فەرموودەی تریش ئەیسەلمێنێت.

وەئەو زانایەنەشی کە بەڵگەی ئایەتەکەی سورەتی (النساء و المائدة)ش دەهێننەوە بۆشکانی دەست نوێژ کە خوای گەورە دەفەرموویت(أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ) دەڵێن: ئەو بەرکەوتنە ڕووداوی بچوك(حدث الأصغر) ە و مەبەستی دەست بەرکەوتنەو بۆیە دەبێت دەست نوێژ بگیرێتەوە.

بەلام هاوەڵی بەڕێزو وەرگێڕی قورئان ئیبن عەباس(خوایان لێ رازی بێت) کە تەفسیری قورئان بەقورئان دەکات و دەفەرموویت: مەبەست لە وشەی(أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ) ڕووداوی گەورە(حدث الأكبر)ە و بۆ کاری سەرجێی و لەش گرانی باسی کراوە ، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی تری سورەتی ال عمران کە خوای گەورە لەسەر زمانی مەریەمکە کاتێك هەواڵی سکپڕی پێ دەدرێت بە پێغەمبەر عیساوە(سەلامی خوایان لێ بێت) دەفەرموویت(وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ)واتە: چۆن من منداڵم دەبێت لەکاتێکدا کەس توخنم نەکەوتوە واتە: هاوسەرم نیەو کاری سەرجێیم لەگەڵ دا نەکراوە.

لێرەدا ئیبن عەباس(خوایان لێ رازی بێت) دەفەرموویت: ئەو بەرکەوتنە بۆ ڕووداوی گەورەو کاری سەرجێ یيە نەك ڕووداوی بچوك و دەست نوێژ شکاندن.

کەوابو پاش باس کردنی بەڵگەکان بە کورتی گەشتینە ئەو ئەنجامەی کە بێگومان بە دەست بەرکەوتنی ژن و مێرد یان بەرکەوتنی پیاو و ئافرەتی نامەحرەمیش بەبێ شەهوەت و ئارەزوو دەست نوێژ ناشکێنێت و، ڕای پەسەندیش لەم باسەدا بێ دەمارگیری ڕای ئەو کۆمەڵەی شەرعناسان کە دەفەرموون:دەست نوێژ ناشکێت پەسەندترە.

---

**پرسیاری(١٨)**

حوکمی قاقای پێ کەنین بۆ دەست نوێژو نوێژکردن چی یە؟

**وەڵام:**

هیچ بەڵگەیەکی ڕاست و درووستمان لەبەردەست دانیە کەوا قاقای پێکەنین لە کاتی دەست نوێژدا یان لەدەرەوەی دەست نوێژدا، دەست نوێژ بشکێنێت!، و بەلام شەرع ناسان دەفەرموون: قاقای پێکەنین لەناو نوێژدا نوێژ بەتاڵ ئەکاتەوە و ئەبێت نوێژەکە دووبارە بکرێتەوە.

---

**پرسـیاری(١٩)**

گـەر گـومـانـمـان بۆ درووسـت بو لـەدەسـت نـوێژەکـەمـان لـەدەرەوەی نـوێژو ناو نـوێژدا دەبێت چـی بـکـەین؟

**وەڵام:**

ئـەگـەر گـومـانـمـان بۆ دروسـت بوو لـە دەسـت نـوێژەکـەمـان، ئـەوا زانایان و شـەرع ناسـان ئـدەفـەرموون: با ئـەوکـەسـەی گـومـانـەکـەی بۆ دروسـت بووە، وا حـسـاب بـکـات کـە دەسـت نـوێژی هـەیـە چونکـە لـە هـەبوونی دەسـت نـوێژەکـە دڵنیابوە تا یـەکـلایـی بونـەوەی لـەوەی کـە دەسـت نـوێژی شـکـاوە.

وە لـەکـاتـی نـوێژ کـردنیش دا هـەمـان حـوکـمـی هـەیـە دەسـت نـوێژی نـەشـکـاوە تا ئـەوەی دڵنیا دەبێت دەسـت نـوێژی شـکـاوە.

---

**پرسـیاری(٢٠)**

ئـەوحـاڵـەتـانـەی سـونـنـەتـن دەسـت نـوێژمـان هـەبێت بۆی کـامـانـەن؟

**وەڵام:**

*کـاتـی قـورئـان خـوێنـدن.

*کـاتـی زیـکـرکـردن.

*کـاتـی خـەوتـن.

*لـەش گـران ئـەگـەر ویسـتـی شـت بـخـوات یان بـخـواتـەوە یان بـخـەوێت یان دووبارە کـاری سـەرجێی بـکـاتـەوە.

*ئـەگـەر خـواردنێك بـخـوات بـەئـاگـر برژاوبێت.

*دەسـت نـوێژ گـرتـنـەوە بۆ هـەمـوو نـوێژێك.

*لـەکـاتـی هـەمـوو دەسـت نـوێژ شـکـانـدنێکـدا.

*پاش شـۆردنی مـردوو.

*دوای ڕشـانـەوە.

---

**پرسـیاری(٢١)**

حـوکـمـی دەسـت نـوێژ گـرتـن بۆ تـەواف کـردنی مـاڵـی خـوا چـی یە؟

**وەڵام:**

سـەبارەت بـەدەسـت نـوێژ گـرتـن بۆ تـەوافـی مـاڵـی خـوا(کـەعـبـە) شـەرع ناسـان و زانایان دەفـەرموون: بـەڵـگـەیـەك لـەسـەر فـەڕزو سـونـەتـی دەسـت نـوێژ بۆ تـەوافـی مـاڵـی خـوا لـەبـەردەسـت نیـە.

بەڵکو حوکمەکەی ئەوەیە کە شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: دەست نوێژ بۆ تەوافی ماڵی خوا نەفەرزەو نەسونەتە هەرچەندە وا باشترە کەسەکە دەست نوێژی هەبێت.
ئەمە رای ئیبن حەزمیشە(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەم رایە پەسەندترە،خوای گەورەش زاناترە.

---

**پرسیاری(٢٢)**
حوکمی دەست نوێژگرتن چی یە بۆ قورئان خوێندن و رای پەسەند کامەیە؟
**وەڵام:**
سەبارەت بە حوکمی دەست نوێژگرتن بۆ کاتی قورئان خوێندن رای جیاوازی لەسەرە لەلایەن پێشەوایان و شەرع ناسان و زانایانی بەڕێزەوە(ڕەحمەتی خوایان لێ بێت)
پێشەوایان (مالیك، شافیعی، ئەحمەد) وزۆرینەی شەرع ناسان دەفەرموون: بەبێ دەست نوێژ نابێ دەست لەقورئان بدەیت.،بەڵگەشیان ئایەتی (٧٩) سورەتی(الواقعة)یە کە خوای گەورە دەفەرمووێت(لَّا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ) واتە: تەنها پاکەکان نەبێت کەس دەستی لێ نادات.
لەگەڵ ئەو فەرموودەی عەمری کوڕی حەزم(خوای لێ ڕازی بێت) ئەفەرمویٚ پێغەمبەری خوا(صلی اللەعلیە وسلم) نامەیەکی بۆخەڵکی یەمەن نوسی تیایدا هاتبوو کەوا تەنها کەسی پاك دەست لەقورئان ئەدات، بەڵام ئەم فەرموودەیە شێخ ئەلبانی دەفەرمووێت: لاوازەو ،بەڵام بەکۆی هەمووان وەردەگیرێت.
لەبەرامبەریش دا پێشەوایان(ئەبو حەنیفە،ئیبن حەزم، ئیبن قەیم)و کۆمەڵێکی زۆری شەرع ناسانیش (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) دەفەرموون: ئایەتەکە نابێتە بەڵگەی هەبونی دەست نوێژ یان لەش پاکی بۆ هەڵگرتن و خوێندنی قورئان چونکە دڵنیا نەبوون لە هائی ڕاناوی (يَمَسُّهُ) کە ئەگەڕێتەوە بۆ قورئان رای زانایان لەسەر ئەوەیە ئەگەڕێتەوە بۆ کیتابی مکنون کە کتێبێکی نادیاری پارێزراوە(لوح المحفوظ) ئەو پاکانەش تەنها فریشتەکانن دەستی لێ دەدەن و چەندین ئایەتی تری قورئانیش کەباس لەپاکان دەکات مەبەستیان فریشتە بەڕێزەکانەو ئەوانەشی خۆیان پاك دەکەنەوە مرۆڤەکانن.
هەروەها کۆمەڵێکی تر لەشەرع ناسانی کۆن و نوێش وەك(ئیبن المونزیر، ئەلبانی،شەوکانی،ئیبن عوسەیمینیش) (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) هەموو فەرموویانە: دەست نوێژ مەرج نیە بۆ قورئان هەڵگرتن و دەست لێدان و خوێندنی.
وە مرۆڤی باوەڕدار لە دەست نوێژدا بێت یان بێ دەست نوێژ هەر پاکەو دەتوانێت دەستی لێ بدات وە ئەم رایەشیان پەسەندترە.

---

## بەشی هەشتەم
## (مەسح کردن و ئەحکامەکانی)

---

**پرسیاری(١)**

پێناسەی خوف(بەربەستەکان) چی یە؟

**وەڵام:**

خوف (بەربەستەکان)واتە: گۆرەویەکی چەرمینە کە تاقولە پێ دائەپۆشێت، وە بەمانای بەربەست دێت، واتە: هەرشتێك ڕێگر بێت لەبەرکەوتنی ڕاستەوخۆی ئاو بەلاشەی مرۆڤ، بەڕای زانایان و شەرع ناسان لە ئێستادا گۆرەویش حسابی خوفی بۆ ئەکرێت لەم سەردەمەدا.

---

**پرسیاری(٢)**

ماوەی کاتی مانەوەی مەسحی خوف چەندێکە بۆ کەسێکی نیشتەجێی ماڵی خۆی و کەسێکی گەشتیارو موسافیر؟

**وەڵام:**

سەبارەت با کاتی مانەوەی مەسحی خوف(بەربەستەکان) بە پێی بەڵگەی فەرموودەی ڕاست و دروست و زانایان و شەرعناسان دەفەرموون: کەسێك کەلەماڵ و شارەکەی خۆیدا بێت تا شەوو ڕۆژێک بۆی هەیە بەسەر خوفەوە مەسح بکات و، وەکەسێکیش کە لەسەفەردایە تا سێ شەوو ڕۆژ دەتوانێ مەسح بکات بەسەرخوفەکانیەوە.

---

**پرسیاری(٣)**

مەرجەکانی مەسحی خوف(بەربەستەکان) چی یە؟

**وەڵام:**

مەرجەکانی مەسحی خوف(بەربەستەکان) ئەوەیە کەوا لەسەر دەست نوێژ لەپێ کرابێتن، وە دەبێت خوفەکانی تاقولە پێی داپۆشی بێت.

وە لە نەمان و شکانی دەست نوێژی یەکەمەوە دەتوانرێت مەسح بکات، واتە: دوای ئەوەی کە جاری یەکەم دەست نوێژی گرت و خوفەکانی لەپێکردو دەست نوێژەکەی شکاو نەما، دوای ئەوە دەتوانێت تەنیا مسحی خوفەکانی بکات.

ڕایەکی تری شەرع ناسان دەفەرمووێت: لە کاتی لەپێکردنی خوفەکانیەوە کاتەکەی دەست پێ دەکات ، ئەم دوو ڕایە پەسەندن و دەتوانرێت کار بەهەردووکیان بکرێت.

---

**پرسیاری(٤)**

کوێی خوف(بەربەستەکان) مەسح دەکرێت و بەچی شێوەیەك؟

**وەڵام:**

سەبارەت بە مەسحی خوف(بەربەستەکان) ، شەرع ناسان دەفەرموون: بەشی سەرەوەی مەسح دەکرێت و بریتی یە لە یەکجار دەستی تەڕ هێنانی بە رووی دەرەوەی خوفەکەدا.
وە پێی راستی بەدەستی راست مەسح دەکات بەدەست هێنان بەبەشی سەرەوەی پێی دا تا کۆتایی ، وە قاچی چەپیش بەدەستی چەپی،وە رای ئەو شەرعناسانە پەسەندترە کەدەفەرموون: خوف هەر بەشی سەرەوەی پێ مەسح ئەکرێت.

---

**پرسیاری(٥)**

ئەو شتانەی مەسحی سەر گۆرەوی یان خوف بەتاڵ دەکاتەوە چین باسیان بکە؟

**وەڵام:**

١. لەکاتی لەش گرانی و ئەوانەی لەچوار چێوەی حوکمی لەشگرانی دان.
٢. حەیز و زەیستانی.
٣. تەواوبونی ماوەی مەسحی خوفەکە.
٤. بەداکەندنی خوفەکە مەسحەکەش بەتاڵ ئەبێتەوە بەڵام دەست نوێژەکەی ناشکێت.
٥. دەست نوێژ نەمان و شکان پێش لەپێکردنی خوف.

---

**پرسیاری(٦)**

چۆنیەتی مەسحی سەرپۆشی ئافرەتان چۆنە؟

**وەڵام:**

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە(رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئەگەر ئافرەتێك ترسی سەرمای هەبوو ئەتوانێت مەسحی سەرپۆشەکەی بکات بەو مەرجەی چەند تاڵە مویەکیش تەڕ بکات لەگەڵیدا، چونکە دایکە ئوم سەلەمە(خوای لێ رازی بێت)مەسحی سەری لەسەر سەرپۆشەکەیەوە کردووە، واتە: لەکاتی پێویستیدا رێ پێدراوەو هیچ کێشەی نیە.

---

**پرسیاری(٧)**

رای زانایان و شەرع ناسان چی یە لەسەر مەسحی گۆرەوی و رای کامەشیان پەسەندە؟

**وەڵام:**

سێ رای جیاواز هەیە بۆمەسحی گۆرەوی بەم شێوەیە:

ڕای یەکەمیان دەفەرموون: ڕێ پێدراو نیە مەسحی گۆرەوی مەگەر بنی گۆرەوییەکە بە چەرم داپۆشراو بێت.
ڕای دووەمیان دەفەرموون: ڕێ پێدراوە مەسحی گۆرەوی بەو مەرجەی شوێنی فەرزی شۆردنی پێ یەکان بگرێتەوەو پێوەی نوسابێت و تا قولە پێی داپۆشی بێت.
ڕای سێ یەمیشیان دەفەرموون: ڕێ پێدراوە مەسحی گۆرەوی ئەگەر تەنکیش بێت بەڵام دەبێت تا قولە پێی داپۆشی بێت.
ڕای پەسەندیش پۆلی سێ یەمە کە دەفەرموون: ڕێ پێدراوەو ئەگەر گۆرەویەکە تەنکیش بێت یان کونیشی تێدا بێت هیچ کێشەیەکی نیە.

---

**پرسیاری(٨)**

مەسحی گەچی شکاوی چۆن دەکرێت؟

**وەڵام:**

بە ڕای هەر چوار پێشەوایانی مەزهەبەکان و زۆربەی شەرع ناسان(ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) ڕێ پێدراوە کە مەسحی گەچی شکاوی بکرێت لەجیاتی شۆردنیان، ئەویش بەو شێوەیەی کە دەستی تەڕ دەهێنرێت بە سەر گەچەکەدا، وەمەسحی گەچی شکاوی ڕێ پێدراویشە بۆکاتی لەشگرانی، وە هەروەها گەچی شکاوی هەمان حوکمی خوفی نیەوە دەتوانرێت بێ دەست نوێژیش ئەو شوێنە بگیرێتە گەچ.

---

## بەشی نۆیەم
## (غوسڵ دەرکردن(الغسل) و ئەحکامەکانی)

---

**پرسیاری(١)**

پێناسەی خۆشۆردن و(غوسڵ) چی یە لەڕوانگەی زمانەوانی و زاراوەیی یەوە؟

**وەڵام:**

لە (زمانەوانی)دا واتە: شۆردن.
لە (زارەووەش)دا واتە: خۆشۆردن کەبریتیە لە ڕۆشتنی ئاوی پاك بەسەر هەموو لاشەی مرۆڤ دا.

---

**پرسیاری(٢)**

ئەو شتانەی خۆشۆردن و(غوسل) پێویست دەکات چین بیان نوسە بەخاڵ؟

**وەڵام:**

١. هاتنە دەرەوەی ئاوی مەنی لەکاتی خەوتندا یان لەکاتی بەخەبەربوندا.

٢. بەبەرکەوتنی جێ ی خەتەنەی ژن و پیاو، بە داغل بونی گۆپکەی زەکەری پیاو بۆ زێی ئافرەت بێ ئاو هاتنەوە.

٣. سوڕی مانگانەو پاش مناڵ بون.

٤. موسوڵمان بونی بێباوەڕ.

٥. نوێژی هەینی.

٦ـ مردن

---

**پرسیاری(٣)**

ئەگەر ئافرەت کاری سەرجێی کردو دوای خۆشۆردن و(غوسڵ)ەکەی ئاوی مەنی لەداوێن و زێی هاتە دەرەوە ئایا خۆشۆردنەوەی لەسەرە یان دەبێت چی بکات؟

**وەڵام:**

نەخێر پێویست بە خۆشۆردن ناکاتەوە تەنها دەست نوێژی دەشکێت و پاش تارات گرتن و شۆردنی داوێنی تەنها پێویستە دەست نوێژ بگرێتەوەو پێویست ناکات ڕارابێت و خۆی بشواتەوە.

---

**پرسیاری(٤)**

لەچی کاتێکدا ژن و مێرد ئەگەر ئاوی مەنیشیان نەهاتبێتەوە دەبێت غوسڵ دەربکەن و خۆشۆردنیان لەسەر پێویست دەبێت؟

**وەڵام:**

لەکاتێکدا سەری گۆپکەی زەکەرو توڵی پیاوەکە لەناو داوێن و زێی خێزانەکەیدا ون بوبێت بێ ئەوەی ئاوی مەنیشیان هاتبێتەوە، ئەواتە غوسڵیان لەسەریان پێویست دەبێت و پێویستە خۆیان بشۆن.

---

**پرسیاری(٥)**

خۆشـۆردن و(غوسڵ)ە سـوننەتەکان کامانەن بیان نوسـە؟

**وەڵام:**

١. جەژنەکان هەم سـوننەتەو هەم بە واجبیش باسـی لێوە کراوە.

٢. کەسێك کەهۆشی هاتەوە دوای ئەوەی لەهۆش خۆی چوبوو سـونەتە پاش هۆش هاتنەوەی غوسلی خۆی دەرکات.

٣. لەکاتی حەج و عەمرە.

٤. چونە ناوشاری مەککە.

٥. دوای هەموو سەر جێی یەك و جوت بونێك ئەگەر ویستی دووبارەی کاتەوە.

٦. دوای مردو شۆردن.

٧. خوێنی جاری (ئیستیحازە).

---

**پرسیاری(٦)**

ڕوکنەکانی خۆشۆردن و(غوسڵ) چین بیان نوسـە؟

**وەڵام:**

١. نیەت هێنان بەدڵ.

٢. ئاو کردن بەسەر هەموو ئەندامەکانی جەستەداو تەڕبونی هەموو لاشە.

---

**پرسیاری(٧)**

پێویستی و واجباتەکانی خۆشۆردن و(غوسڵ)چین بیان نوسـە؟

**وەڵام:**

١. دەست پێکردن بەناوی خوا(بسم الله)کردن.

٢. دەست نوێژگرتن(الوضوء)، بەڵام دەتوانرێت شۆردنی پێ یەکانیش بخرێتە دوای خۆشۆردن و(غوسڵ)ە کە.

---

**پرسیاری(٨)**

سوننەتەکانی خۆشۆردن و(غوسڵ) چین بیان نوسـە؟

**وەڵام:**

١. شۆردنی دەست (٣) جار.

٢. شۆردنی عەورەت بەدەستی چەپ و پاك کردنەوەی.

٣. شتنەوەی دەست پاش ئەوەی کەعەورەت شۆردرا.

٤. دەست هێنان و خشاندن بەهەموو لاشەدا.

٥. ئاو ڕادان لەدەم و لوت.
٦. پێش خستنی لای ڕاست لەشۆردن دا.
٧. دواخستنی شۆردنی پێ یەکان بۆ پاش خۆشۆردن.

---

**پرسیاری(٩)**

چۆن خۆشۆردن و(غوسڵ)ی ئافرەت دەردەکرێت؟

**وەڵام:**

خۆشۆردن و(غوسڵ)ی هەروەك خۆشۆردنی پیاو وایە لەکاتی لەش گرانی دا ،کە ئەویش نیەت هێنان و گرتنی تاراتێکی جوان و پاشان دەست نوێژ دەگرێت و پێ یەکانی دەتوانێت بخاتە کۆتایی خۆشۆردنەکەی، پاشان سێ جار ئاو دەکات بەسەری داو،وە بە لای ڕاست لای چەپی لاشەشی ئاوی پێدا دەکات و، دەست دەخاتە هەموو کون و قوژبنێکی لاشەی و لەکۆتایشدا پێ یەکانی دەشوات و، دەتوانێت بەو دەست نوێژەی سەرەتاشەوە نوێژ بکات بەو مەرجەی ڕووداوی دەست نوێژ شکاندن ڕوی نەدابێت لەکاتی خۆشۆردن دا، بەڵام کێشە نیە ئەگەر دەستی بەر پێش و پاشیشی کەوتبێت، وەلەوکاتەشا پێویست ناکات ئافرەتەکە پرچەکانی بکاتەوە تەنها سێ مشت ئاوبەسە تابیان کات بەقژیاو بەر لاشەو جەستەی بکەوێت،بەڵام لەکاتی سوڕی مانگانەو پاش منداڵ بون دەبێت پرچەکانی بکاتەوە.

---

**پرسیاری(١٠)**

ئەو سێ خاڵە باس بکە کە لەکاتی خۆشۆردن و(غوسڵ)ی خوێنی سوڕی مانگانە(حەیز)و خوێنی پاش منداڵ بون(نیفاس) دەبێت زیاتر ڕەچاو بکرێت؟

**وەڵام:**

١. بەکارهێنانی سابون وشامپۆ بۆپاککردنەوە باشترە.
٢. وا پێویست ئەکات پرچ وپەلکەکی قژی بکاتەوە.
٣. پاککردنەوەی پەڵەی خوێن و ئەوشوێنەی کە خوێنی بەرکەوتوە.

---

**پرسیاری(١١)**

ئەگەر دوو خۆشۆردن و(غوسڵ) بەیەکەوە کۆبونەوە دەبێت چۆن غوسڵەکانمان دەربکەین؟

**وەڵام:**

سەبارەت بە کۆ بونەوەی دوو خۆشۆردن و(غوسڵ) بەیەکەوە دوو ڕای لەسەرە:

**یەکەم:** هەندێک لەشەرع ناسان و زانایان دەفەرموون: کە بەیەك جار نیەت بهێنرێت بۆهەردوو خۆشۆردن و(غوسڵ)ەکەو بەیەك جار غوسڵەکە دەربکات.

**دووەم:** وەهەندێك لەشەرع ناسان و زانایانی تریش دەفەرموون: کە دەبێت هەریەکەیان بەجیا غوسڵی بۆدەر بکات.
وە ڕای پەسەندیش ئەوەیە ئەگەر هاتوو ئاومان زۆر بوو واباشترە هەریەکەیان بەجیا غوسڵی بۆدەربکرێت تاوەکو لە خیلافەکە دەربچین.
وە ئەگەر ئاویش کەم بوو ئەوا ڕێ پێدراوە بەیەك جار نیەت بۆهەر دووکیان بهێنرێت و غوسڵی هەردووکیان پێکەوە دەر بکات.

---

**پرسیاری(١٢)**

ئایە ئافرەتی خاوەن عوزر بە سوڕی مانگانەوو پاش منال بون لەگەڵ کەسی لەش گران بۆیان هەیە لەمزگەوت دا بمێننەوە؟

**وەڵام:**

بەپێ ڕای زۆربەی شەرع ناسان و زانایان نابێت ئافرەتی خاوەن عوزر بە سوڕی مانگانەوو پاش منالّ بون و کەسی لەش گران بچنە مزگەوتەوە تەنها لە حاڵەتی ناچاری و پێویستی دا نەبێت.

---

## بەشی دەیەم
## (تەیەموم و ئەحکامەکانی)

---

**پرسیاری(١)**

پێناسەی تەیەموم لەڕوی زماناوانی و شەرعی چی یە؟

**وەڵام:**

لە (زمانەوانی)دا واتە: مەبەست و ئاڕاستە.
لە (زارەوەش)دا بریتی یە: لەبەکارهێنانی صەعیدە،هەموو شتێکی پاك هەیە لەسەر ڕووی زەوی ، لەجیاتی ئاو بۆدەست نوێژو غوسڵ بەکار دێت هەتاهەرچی ئەو دووانە ڕێی پێ دەدەن ئەمیش ڕێی پێبدات.

---

**پرسیاری(٢)**

تەیەموم کردن جێی چی دەگرێتەوەو لەجیاتی چی و چی ئەنجام دەدرێت؟

**وەڵام:**

جێگای دەست نوێژو غوسڵ دەگرێتەوە لەکاتی نەبونی ئاودا،یان بەئاسانی ئاو دەست نەکەوێت، یان بەکارهێنانی ئاو زەحمەت بێت.

---

**پرسـياری(٣)**

ئەوكاتانەی تەیەموم کردن تیایدا دروست و ڕێ پێدراوە چی کاتێکن؟

**وەڵام:**

١. لەکاتی نەبونی ئاو ، وە ئاو دەست نەکەوێت.

٢. لەکاتێکدا ئاوهەیەبەڵام نەتوانی بەکاری بهێنی و بەکار هێنانی زەحمەت بێت وبەشی دەست نوێژ نەکات یان تەنها بەشی خواردنی پێ یەو ترسی نەبونی ئاوی هەیە، یان ترسی بەکار هێنانی ئاوی هەیە بەهۆی بریندداری و نەخۆشی قورس یان سەرماو سۆڵە، کە لە سەفەردا کە شوێنی گەرم کەرەوەو خۆ وشك کردنەوەی دەست نەکەوێت.

---

**پرسـياری(٤)**

ئاومان هەیە بەڵام چەند عوزرێکمان لەبەردەست دایە بۆ تەیەموم ئەو هۆکارو عوزرانە چین؟

**وەڵام:**

١. ئەوکەسەی ئاوی پێیە بەڵام بەشی دەست نوێژ ناکات.

٢. ئەوکەسەی ئاوی پێیە بەڵام ترسی ئەوەی هەیە خۆی یان هاوڕێکەی یان ئاژەڵەکەی پێویستیان بێت و تینویان بێت.

٣. لەبەر نەخۆشی نەتوانێت بەکاری بهێنێت.

٤. کەسێك کە بریندارە و بەکارهێنانی ئاو زەرەری پێ بگەیەنێت.

٥. وەکەسێك لەترسی سەرما نەتوانێت ئاو بەکار بهێنێت.

---

**پرسـياری(٥)**

صەعید(گڵ و زەوی) واتای چی دەگەیەنێت؟

**وەڵام:**

شەرع ناسان دوو پێناسەیان بۆ(صەعید)کردووە:

**پۆلی یەکەمیان** دەفەرموون: هەرچی بەڕووی زەویەوە دیارە لەگڵ ولم وچەوو زیخ و شتی تر کە پێی دەوترێت، گڵ و زەوی(صەعید) ئەمەش ڕای ئیمامی ئەبو حەنیفەو، ئەبو یوسف و، ئیمام مالیکەو، ئیبن تەیمیەش پێی پەسەندترینە، هەروەها ئیبن و حەزم، بەڵام ئەوەی بەمەرج داناوە، کەدەبێت بە زەوی یەوە چەسپاوبن.

**پۆلی دووەمیشیان** دەفەرموون: هەرگڵ وخۆڵە هیچی تر کەئەمەش بۆ چونی ئیمامی شافیعی و،حەنبەلیەکان و، ئەبو سەورەو، ئیبن مونزیریش وای بۆ چووە. بەڵام پۆلی یەکەمیان ڕایان پەسەندترە.

---

**پرسـیاری(٦)**

تـەیـەمـوم چـۆن دەکـرێت و ڕای پـەسـەنـد کـامـەیـە؟

**وەڵام:**

شـەرع ناسـان بـەدوو شـێوە تـەیـمـمـوم باس دەکـەن:

**پۆلـی یەکـەمیان** دەفەرموون: ئەوەیە یەکجار لەپـی دەستەکان بەصـەعیدەکەدا(گـڵ و زەوی)دا دەکـێشـێ دواتر بەرزیان دەکاتەوەو فوی لـێ ئەکات ئینجا دەم وچاوو ، دەسـتەکانـی پـێ مـەسـح دەکات،کـەئیبن تـەیـمـیـەش ئەمـەیانـی لای پـەسـەنـدتر بووە.

**پۆلی دووەمیشیان** دەفەرموون: دەبێت دووجار ناو لەپـی دەسـتەکان بدرێت بە بەصـەعیدەکـەدا(گـڵ و زەوی)دا، ئـەویش یـەکـێکـیان بـۆدەم و چـاوی ، ئـەوی تریشـیان بۆ دەسـتـەکـان، وە دەبێت تا ئـەنیشـکـەکـانی پـێ مـەسـح بـکرێت. بەڵام پۆلـی یـەکـەمیان ڕایان پەسـەندترە.

---

**پرسـیاری(٧)**

چۆن تـەیـەموم بـەتاڵ دەبێتـەوە؟

**وەڵام:**

هـەرچـی شـتـێك دەسـت نـوێژ بشـکـێنێت ئەوە تەیەمومیش بـەتاڵ دەکاتەوەو ، وە نـەمانـی هـۆیـەکانـی تـەیـەمومیش بـەتاڵـی دەکـاتـەوە.

---

**پرسـیاری(٨)**

ئـەگـەر کـەسـێك تـەیـەمـومـی کـردو پـێش نـوێژ ئاوی دەسـت کـەوت دەتوانێت نوێژ بـکـات؟، وە ئـەگـەر لـەناو نوێژەکـەدا ئاوی دەسـت کـەوت چـی دەکـات؟، وە ئـەگـەر دوای نـوێژەکـەی ئاوی دەسـت کـەوت ئایا نـوێژەکـەی دەگـێڕێتـەوە یان نـوێژەکـەی دروسـتـە؟

**وەڵام:**

ئـەگـەر کـەسـێك تـەیـەمـومـی کـردو پـێش نـوێژ ئاوی دەسـت کـەوت نابێت نـوێژەکـەی بـکـات و پێویسـتـە دەسـت نـوێژ بـگـرێت بە ئاو وە تـەیـەمومـەکـەی بـەتاڵ دەبێتـەوە،

وە ئـەگـەر لـەناو نوێژەکـەدا ئاوی دەسـت کـەوت ، ئـەوە دوو ڕای لـەسـەرە ئـەوەی کـەپـەسـەنـد بێت ئەوەیە کـەبەردەوام ئـەبێت لـەنوێژەکـەو نـوێژەکـەی نابڕێت و نـوێژەکـەشـی دروسـتـەو،نـەخێر نـوێژەکـەی ناکـاتـەوەو نـوێژەکـەی دروسـتـە.

---

## بەشی پانزەیەم و کۆتایی
## (سوڕی خوێنی مانگانەو پاش منداڵ بون و خوێنی جاری(الحیض والنفاس الإستحاضة))

---

**پرسیاری(١)**

چەند جۆر خوێن لەداوێنی ئافرەت دێتە دەرەوەو چەندیان پیسن و کامەشیان پاکە؟

**وەڵام:**

سێ جۆر خوێن لەداوێنی ئافرەت دێنە دەر ئەوانیش بریتین لە:

١. خوێنی سوڕی مانگانە(حەیز)

٢. خوێنی زەیستانی(نیفاس)

٣. خوێنی جاری داوێن(ئیستیحازە)

خوێنی حەیزو نیفاس پیسن بەڵام خوێنی ئیستیحازە پاکە.

---

**پرسیاری(٢)**

خوێنی حەیز(سوڕی مانگانە) چی یەو چۆنە ڕەنگ و بۆنی؟

**وەڵام:**

خوێنێکی ڕەشی خەستە یان سوری تۆخە و بۆنیشی ناخۆشە لەداوێنی ئافرەت و لە جێگایەکی دیاری کراوی ئافرەت و لەکاتی دیاری کراودا دێتە دەرەوە، وە ڕۆژەکانیشی دیاری نەکراوە لەئافرەتێکەوە بۆئافرەتێکی تر ئەگۆڕێت وخوای گەورە لەسەر کچانی ئادەمی نوسیوەو لایەنی کەمی ڕۆژەکانی شەو ڕۆژێکەو لایەنی زیادی تا پانزە شەوو ڕۆژەو بەپێی داب و نەریتی ئافرەتانی ئەو شوێنە حسابی لەسەر دەکرێت.

---

**پرسیاری(٣)**

هاتنی سوڕی مانگانە چۆن دەست پێ دەکات؟ کۆتاییەکەی چۆن دەزانرێت؟

**وەڵام:**

دەست پێکردنی سوڕی مانگانە لەوکاتەوەیە کە دڵۆپە خوێنی ڕەش یان خەست و بۆن ناخۆش لەسەرەتای سوڕی مانگانەکەیدا دەردەکەوێت،وەتەواو بونیشی ئەوکاتەیە کەخوێن وئاوی زەردباو و لێڵ دێتە دەرەوە ، دەوەستێت و ئەویش یان وشك ئەبێت، یان بەهاتنی ئاوێکی سپی کەلە کۆتایی سوڕی مانگانەوە دێت و بەو شێوەیە کۆتایی بەسوڕی مانگانە دێت.

---

**پرسیاری(٤)**

چی شتێك له سەر ئافرەتی حەیزدارو زەیستان حەرامە؟

**وەڵام:**

١. نوێژ کردن.
٢. ڕۆژوو گرتن.
٣. سەرجێی کردن و جوت بون.
٤. تەوافی کەعبەی پیرۆزو ماڵی خوا.

---

**پرسیاری(٥)**

ڕای زانایان چی یە لەسەر کەفارەتی جوت بون لەکاتی حەیزو زەیستانی دا؟، وە ڕای کامیان پەسەندە؟

**وەڵام:**

بەڕای هەر چوار مەزهەبە بەرێزەکە سیانیان دەفەرموون: هیچ کەفارەتێکی لەسەر نیە جگە لەتەوبەکردن، ئەوانیش بەپێی بەڵگەی فەرموودەی ڕاست و دروست.
بەڵام ئیمامی ئەحمەدو هەندێك لەشەرع ناسانیش دەفەرموون: کەفارەتی لەسەرە ئەویش بەپێی فەرموودەیەك کەزۆربەی زانایانی فەرموودە ناس دەفەرموون: کە فەرموودەیەکی لاوازە ، بۆیە ڕای پەسەند ئەوەیە ئەگەر بەڕازی بونی ژن و مێردەکە سەر جێیان کردبێت ئەوە تاوانی گەورەیان ئەنجام داوەو دەبێت تەوبەی لێ بکەن و هیچ کەفارەتێکیان لەسەر نیە، بەڵام ئەگەر بەزۆری پیاوەکە ئەو کارەی کردبێت تەنها پیاوەکە تاوانبارەو دەبێت تەوبەی لەسەر بکات و خێزانی تاوانبار نابێت.

---

**پرسیاری(٦)**

سنوری دەست بازی ژن و مێرد تاچەندێك ڕێگەی پێدراوە لەڕوانگەی شەرعەوە لەکاتی سوڕی مانگانەدا؟وە چی جێگایەکیش جائیز نی یەو حەرامە لێی نزیك بینەوە بۆ هێنانەوەی شەهوەت؟.

**وەڵام:**

شەرعناسان لەم بابەتەدا بوون بەدوو پۆلەوە:

**پۆلی یەکەمیان:** فەرموویانە کاتێك ئافرەت لەحەیزو زەیستانیدایە مێردی بۆی نیە چێژ لەمەسافەی نێوان ناوکی تائەژنۆی وەرگرێت ئەمیش بەوەرگرتنی چەند فەرموودەیەکی لاواز کەزانایانی فەرموودە ناس بە لاوازیان داناون.

**پۆلی دووەمیشیان:** دەفەرموون جگە لە عەورەت ودەرچەی کۆم هیچ کێشەیەکی نیە وپیاو دەتوانێت ئارەزووی خۆی بشکێنێت ئەمەش بەپێی وەرگرتنی فەرموودەی ڕاست و دروست و،

وە ڕای پەسـەندیش ئەوەیە کـەپیاو بۆی هـەیە هـەموو چێژێك لەخـێزانی وەربگـرێت لـەکاتی سـوڕی مانگـانەو زەیسـتانیدا بەومـەرجەی نـزیکـی پێش و وپاشـی خـێزانی نـەکـەوێت کـەدەکاتە زێ و کـۆم.

کـەوابو ئەوەی ڕێ پێدراو نـی یە زێی خـێزان و وەدرچـەی کـۆمیـەتی حـەرامەو نابێت لـێی نزیك ببێتەوە.

---

**پرسیاری(٧)**

چـی شـتێك بۆ ئافرەتێك لە سـوڕی مانگـانەدا بێت جائیزە؟ بەخاڵ باسیان بکە؟.

**وەڵام:**

١. زیکـری خـوای گـەورەوقـورئان خـوێندن.

٢. سـوجـدەی تیلاوە، کـەئایـەتی سـوجـدەی گـوێ لـێ بوو، وە سـوجـدەی شـوکر.

٣. قورئان هـەڵگـرتن بەپەردەوە واتە بەدەسـت کـێش یان بەقـەڵـەم پەڕەکـانی هـەڵ بدەیتەوە ، بەڵام بە مۆبایل ئاسـاییە بێ پەردەو دەسـت کـێش.

٤. کـاتێك پیاوێك سـەری لەسـەر ڕانی خـێزانی دابنێت کـەلەحـەیزدایەو قورئانیش بخـوێنێت.

٥. ئامادەبونی نوێژی جەژنەکـان لە نوێژگـەدا.

٦. چونە مزگـەوت لـەکاتی پێویسـتی و ناچاریدا.

٧. تێکـەڵاو بونی ژن ومێردو دوورنەکـەوتنەوە لـەیەك و خزمـەت کـردنی ماڵ و منداڵ و مێرد.

٨. ژنی حـەیزدارو مێردەکـەی دەتوانن لـەژێر یەك جێگـەی نوسـتن دا بخـەون.

---

**پرسیاری(٨)**

بەکـێ دەوترێت زەیسـتان؟، وە پێناسـەی خـوێنـی(نیفـاس)پاش منداڵ بون چـی یە؟

**وەڵام:**

بەوئافرەتە دەوترێت زیسـتان کـەمناڵـی بووە.

سـەبارەت بە پێناسـەکـەشـی ئەوخـوێنەیە کـە لـەدوای مناڵ بوون لـەداوێنـی ئافرەت دێتە دەرەوە.

---

**پرسیاری(٩)**

کاتی دیاری کراوی خوێنی پاش منداڵ بون چەندێکە؟، وە لەچەند ڕۆژ زیاتر دەبێت ئافرەت خۆی بشوات و، گەر پاش ئەو ڕۆژانەش خوێنی هات، حوکمەکەی دەگۆڕێت بۆ چی خوێنێك؟

**وەڵام:**

سەبارەت بە خوێنی پاش منداڵ بون ، کاتێکی دیاری کراوی نیە بەڕای زۆربەی شەرع ناسان و زانایان، بەڵام هەرکاتێك زەیستان هەستی بەپاك بونەوە کرد ئەگەر یەك ڕۆژ پێش چلەش بێت ئەبێت غوسڵ دەربکات،وەلە بەرامبەردا ئەگەر (٤٠)ڕۆژ زیاتری خایاند ئەوە دەبێت ئافرەتەکە خۆی بشوات و ، گەر پاش ئەوە خوێنی هات حوکمەکەی دەگۆڕێت بۆ خوێنی ئیستیحازەو جاری وە هیچ ڕێگریەك ناکات لەنوێژوو ڕۆژوو سەرجێی و تەوافی کەعبەی پیرۆزو ئەو شتانەی بۆ ئافرەتی ئاسایی ڕێ پێدراوە.

---

**پرسیاری(١٠)**

خوێنی جاری(الإستحاضة) حوکمی ئەم خوێنە چی یە؟، وە چی شتێکیش جائیزە بۆ ئافرەتێك خوێنی جاری هەبێت؟

**وەڵام:**

حوکمی خوێنی جاری بەکۆڕای شەرعناسان وەك ئافرەتانی تر پاکەو ڕێ لە هیچ شتیك ناگرێت کە لە کاتی سوڕی مانگانەو پاش منداڵ بون لێی قەدەغەو حەرامە، وە پێویست بەغوسڵ ناکات تەنها بۆنوێژەکان دەست نوێژ دەگرێتەوە.

وە ڕێ پێدراویشە کەوا نوێژبکات، ڕۆژوو بگرێت، قورئان بخوێنێت و دەستی لێ بدات،سەرجێی بکات ،دەتوانێت ئیعتیکافیش بکات ولەمزگەوتیش دا بمێنێتەوە.

ئەو ماڵپەڕو کتێب و سەرچاوانەی سودم لێ یان بینیوە

تەفسیری ئاسان.
ماڵپەڕی مەرکەزی فتوای ئیسلام وێب.

پرس و ڕاوێژ لەسەر ئەحکامەکانی نوێژ.
پوختەی فیقهی شەریعەت.
پوختەی شەریعەتی ئیسلام لەڕوانگەی قورئان و سوننەتەوە.
قەڵای مسوڵمان بۆ زیکرەکانی شەوانەو ڕۆژانە.
وەجیز.

خوای گەورە پاداشتی خێری سەرجەم هەوڵ و ماندوبونی ئەم زاناو مامۆستا بەڕێزانە بداتەوە کەوا ئەم شەریعەتە جوانەیان لەڕوانگەی فتواو کتێب و نوسینەکانیانەوە بۆ ڕون کردوینەتەوە، تاوەکو ئێمەش وەك ئەهلی نقلْ بیان گەیەنین ،جێگای خۆیەتی کە بڵێم: زۆرترین سود کە بینی بێتم لە کتێبی پرس و ڕاوێژ لەسەر ئەحکامەکانی نوێژ بووە کە زۆر بەجوانی و ڕونی سەرجەم بەڵگەکانی باس لێوەکراوە بەبێ دەمارگیری، داواکارین لەخوا کردبێتیە تویشوی دواڕۆژمان.

............................................................................................................................
............................................................................................................
.............................................................................................

سوپاس بۆ خوای گەورە تەواو بو